باشترین هاوڕێ ١٠



شەهید د. عبدالله عزام

# بگە بە کاروان



## لەگەڵ کورتەیەک لە ژیاننامەی نووسەری شەهید

ئامادەکردنی

باوکی عبدالرحمن

﴿ فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى
اللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ
تَنكِيلًا ﴾

النساء: ٨٤

﴿ انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي
سَبِيلِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾

التوبة: ٤١

abu ali alkurdy٤٤

# بگە بە کاروان

نووسینی

شەهید دکتۆر عبداللە عزام

وەرگێڕانی

باوکی عبدالرحمن

# پێشکەشە :

. بە گیانی پاکی شەهیدانی ئیسلام بە گشتی و بەتایبەتی گیانی پاکی شەهید دکتۆر عبداللە عەززام.

. بە هەموو ئەو مسوڵمانە بەجەرگانەی کە دەیانەوێ بگەن بە کاروانی عیززەت و سەربەرزی.

ناوی کتێب: بگە بەکاروان

نووسینی: شەهید د. عبداللە عەززام

وەرگێڕانی: باوکی عبدالرحمن

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠١١

نۆبەی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردنی (٢٧٨٥)ی ساڵی ٢٠١٠ی لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان پێدراوە.

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله (محمد) ﷺ وعلى آله وصحبه وامته إلى يوم الدين.

خوێنەرانی خۆشەویستی کتێبی بگە بە کاروانی (شەهید دکتۆر عبدالله عەززام)، ئەم کتێبە چاوڕوونییەك ئەدات لەسەر چۆنێتی خۆئامادەکردنی مسوڵمان لەسەر جێبەجێکردنی لوتکەی ئیسلام کە (جیهاد)ە، بەراستی جیهاد لەسەر مسوڵمانان فەرزی عەینە ئەگەر بستێك لە خاکی مسوڵمانان بەدەست بێ باوەڕانەوە بوو، بەڵام ئەمڕۆ ئەبینین بستێك لە خاکی مسوڵمانان بە دەستی مسوڵمانانەوە نییە، کەواتە ئەبێت بپرسین جیهاد ئەمڕۆ محلی لەکوێدایە؟!! بۆیە پێویستە مسوڵمانان لەوە هۆشیاربینەوە کە ئەبێت بە وردی مامەڵە لەگەڵ دینەکەیان بکەن و منداڵو گەنجانی خوێنگەرم پەروەردەی ئیمان بکەنو هیجرەتو جیهادی پێغەمبەری ئیسلامیان ﷺ فێر بکەن، تاکو ئەو کاتەی کۆكو کۆمەڵ ئەبن لەسەر جێبەجێکردنی ئەو فەریزە خواییەی کە ئەمڕۆ بە تەواوەتی نەك لە کرداری مسوڵمانان، بەڵکو لە ناخیشیاندا کاڵ بووەتەوەو فەرامۆش کراوە، بۆیە داوام لە خوێنەرانی ئەم کتێبە گرنگە ئەوەیە کە بە وردی بیخوێننەوەو سەرنجی بدەنو دەرسو ئامۆژگاری لێوەربگرن، خوای پەروەردگار لە گوناهی نووسەرەکەی خۆش بێتو بە فیردەوسی بەرزو بڵند شادی بکات. آمین

وصلى الله وسلم على نبينا محمدٍ قائد المجاهدين وعلى آله وصحبه وأُمته أجمعين.

وەرگێڕ

باوکی عەبدوڕەحمان

سلێمانی / ١٠ی موحەڕەمی ١٤٣٢

٢٠١٠/١٢/١٦ز

# پێشەکی

حەمدو سەناو سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و ڕەحمەت‌و سەلامی خوا بۆ سەر گیانی گەورەی پێغەمبەران (موحەممەد) ﷺ و بۆ سەر گیانی یارو یاوەران‌و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

ئەمە پەیامێکی بچووکە نووسیوومە بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ جیهاد گڕئەگرن‌و ئارەزووی شەهیدبوون ئەکەن، ئەم پەیامە لە دوو بەش پێکهاتووە:

یەکەم: هۆیەکانی جیهادو تێکۆشان.

دووەم: هاوار بۆ ئیسلام.

بە کورتەیەک‌و چەند تێبینییەک کۆتاییم بەم پەیامە هێناوە، داواکارم خوای پەروەردگار بیکاتە مایەی سودو کەڵک‌و چاکسازی بۆمان، چونکە خوای پەروەردگار بیسەرو نزیکەو وەڵام دەرەوەیە.

ئارەزووخواز بووم لەسەر وەڵامدانەوەی زۆربەی ئەو نامانەی کە پێم ئەگەن و ڕاوێژم پێئەکەن لەسەر هاتن بۆ ئەفغانستان.

فحيّ على جنات عدن فإنها

منازلك الأولى وفيها المخيم

ولكننا سبي العدو فهل ترى

نعود إلى أوطاننا ونسلم

واتە: وەرە بۆ ناو بەهەشتەکانی بەرقەراری، هەر ئەو بەهەشتانەیە جێگای تۆ بە چادرەکانیانەوە، بەڵام ئێمە دیلی دوژمنین، ئایا تۆ دەبینی بگەڕێینەوە بۆ وڵاتمان‌و لەوێدا سەلامەت بین؟

بەندەی فەقیر: عبدالله عەززام

١٧ی شەعبانی ١٤٠٧ك

١٥ی نیسانی ١٩٨٧ز

# بەشی یەکەم

## هۆیەکانی جیهادو تێکۆشان

حەمدو ستایش بۆ خودا، سوپاسی ئەکەین و داوای کۆمەکی لیٚ ئەکەین و داوای لێبوردنی لێئەکەین و پەنائەگرین بە خودا لە خراپی دەروونمان و ناپاکی کردارەکانمان، هەرکەسێك خوا ڕێنمونی بکات گومڕا نابێت و هەرکەسێکیش گومڕا بێت ڕێنونی وەرناگرێت و شایەتی ئەدەم هیچ پەرستراوێك بەڕاست نییە جگە لە (اللە)، تەنهایەو هاوەڵی نییەو شایەتی ئەدەم کە موحەممەد بەندەو نێردراوی خودایە.

خوای پەروەردگار هیچ ئاسانکارییەك نییە ئەوە نەبێت کە تۆ ئەیکەیت، وە تۆ ئەگەر مەیل و ویستت هەبێت ناڕەحەتی و بێتاقەتی ئاسان ئەکەیت، پاشان: ئەو کەسەی کە ئەمڕۆ ئەڕوانێتە واقیعی مسوڵمانان ئەزانێت بەڵای گەورەیان ئەوەیە کە وازیان لە جیهادو تێکۆشان هێناوە (خۆشەویستی بۆ دونیاو ڕقبوونەوەیان لە مردن)ە، لەبەر ئەمەیە یاخیبوان بەسەر گەردنی مسوڵماناندا زاڵبوون لە هەموو لایەك و لە هەموو شوێنێکدا، ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە کافرەکان لە هیچ شتێك ناترسن جگە لە کوشتارو شەڕ نەبێت ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا﴾ (النساء: ٨٤).

واتە: ئینجا لە پێناو خوادا غەزا و کوشتار بکە، ئەی موحەممەد ﷺ تۆ هەر لە خۆت بەرپرسیت، تۆ باوەڕداران هانبدە بۆ جیهادو کوشتار لە دژی خوانەناسان، بێگومانبە خوا بە هۆی ئەو جیهادەوە لە زەبرو زۆرو خراپەی

ئەو بێباوەڕانە ئەتانپارێزێت هێزو هەڵمەتی خوا لەوان سەختترە لە جەنگداو لە سزاو تۆڵەیشدا توندوتیژترە[١،٢].

ئێمە کاتێك بانگی مسوڵمانان ئەکەین و هەنگاوەکانیان بۆ کوشتار هانئەدەین لە دژی بێباوەڕان لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری زۆرە لەسەرووی هەموویانەوە:

١. تاکو بێباوەڕ سەروەر نەبێت.

٢. لەبەر کەمی پیاو.

٣. لە ترسی ئاگری دۆزەخ.

٤. جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا و وەڵامدانەوەی بانگەوازەکەی.

٥. لەبەر شوێن پێهەڵگرتنی پێشینە باشەکان (السلف الصالح).

٦ـ بۆ دروستکردنی بنکەیەکی بەهێز کە ئەبێتە جێگەی دەرچوون و بەهێزکردنی ئیسلام.

٧. بۆ پارێزگاریکردن لە چەوساوەکانی سەر رووی زەوی.

٨. بەتەماعی بەدەستهێنانی پلەی شەهیدی.

---

[١] ئیمامی تەبەری ئەفەرموێت: هەموو وشەیەکی (عسی) کە بێژەرەکەی (الله) بێت ئەوە بۆ تەحقیق و راستیو حەتمیە. تەفسیری رامان لاپەرەی ٢٠٨. چاپی دووەم. (وەرگێڕ).

[٢] پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (والله لأقاتلنهم حتى تنفرد سالفتي) بخاری واتە: (بە خوا تا سەرم بەجەستەوە بێت جیهادی خۆم دەکەم و ناوەستمە سەر کەس). ئەبوبەکریش خوا لێی رازی بێ جەخت دەکاتە سەر هەمان مەبەستو دەفەرموێت: (ولو خالفتني يميني لجاهدتها بشمالي)، واتە: ئەگەر دەستی راستم جیهادی پاشگەزبووەکان نەکات بە دەستی چەپم دەیکەم. هەروەها لە هەڵوێستێکی مەردانەی تردا دەفەرموێت: (أفينقص الدين وأنا حي) واتە: چۆن ئەم ئاینە نوشوست بێنێت و کەم بکات و من زیندوویم؟!. (فەرهەنگی بانگخوازان، ئەندازیار عوسمان، ل٢٠). (وەرگێڕ).

## ١ـ تاکو بێباوەڕ سەروەر نەبێت:

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ الأنفال: ٣٩

واتە: کوشتار لەگەڵ بێباوەڕاندا بکەن هەتا شیرك و کوفر لە بن دێت و دینداری هەر بۆ خوا ئەبێت، جا ئەگەر وازیان لە کاری خراپ و کوفرو شیرك هێنا ئەوسا هەرچی بکەن خوا پێی بینایەو ئاگادارە.

جا ئەگەر شەڕو کوشتار وەستا ئەوکات کوفرو بێباوەڕی سەرئەکەوێت و شیرك بڵاوئەبێتەوەو بەرپا ئەبێت.

## ٢ـ لەبەر کەمی پیاو:

بەراستی تەنگ و چەڵمەی جیهانی ئیسلامی کەمی پیاوانیەتی بۆ گرتنە دەستی بەرپرسیارێتی و سەرکردایەتی کردنی گەل، هەروەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: "الناس كإبل مائة لا تجد فيها راحلة"[٣]. واتە: خەڵکی وەکو وشتروان لەناو سەد وشتردا وشترێك نییە بارەکەی بە رێك و جوانی هەڵبگرێت. هەروەك چۆن لەناو خەڵکیشدا لەناو سەد کەسدا کەسێك نییە کە کارو فەرمان و ئەرکی سەرشانی بە جوانی و بەرێکی جێبەجێ بکات.

---

[٣] (ضعيف)، بەڵام ئەم فەرموودە (الناس كإبل مائة لا تكاد تجد فيها راحلة) صەحیحەو بوخاری ریوایەتی کردووە. (وەرگێڕ).

"راحلة" بە وشترێكی زۆر بەتوانا ئەوترێت كە لە سەفەردا ناوازە بێت، باری باش هەڵبگرێت، بە وشترێكی زۆر رێكو جوان ئەوترێت و بۆ وشتری نێرو مێ بەكاردێت، ئەو (تاء)ەی كە پێوەیەتی بۆ زیادە موبالەغەیە.

واباسكراوە عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ رازی بێت) بە كۆمەڵێك لە هاوەڵە هەڵبژاردەكانی خۆی فەرمووە: خۆزگە بخوازن، ئینجا هەریەك لەوان یەكی خۆزگەیەكیان خواست، ئینجا ئەوانیش بە عومەریان وت (خوا لە هەموویان رازی بێت) تۆش خۆزگەیەك بخوازە ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەویش فەرمووی: خۆزگە پڕ بەم خانووە پیاوی وەك ئەبوعوبەیدەم هەبوایە.

ئەو پیاوانەی كە زاناو خاوەنی زانیـنن كەمن، وە ئەوانەی كە بە كردەوە هەڵئەسن كەمترن، وە ئەوانەیش كە جیهادو تێكۆشان ئەكەن كەمترو نامۆترن، ئەوانەیش لە كاتی جیهاددا خۆڕاگرن زۆر كەمن بە ئەندازەی ئەوەی لە كەمیدا باس ناكرێت.

جارێكیان روانیمە ئەڵقەیەكی قورئانی كۆمەڵێك گەنجی عەرەب كە هاتبوونە زەوی بە عیززەتو سەربەرزی ئەفغانستان خەریكی خوێندنی قورئان بوون، وتم: بەڵكو كەسێكیان تێدا ببینم كە بە باشی قورئان بخوێنێتەوە و بیكەم بە ماموستایان، بەڵام كەسێكی بەو شێوەیەم تێدا نەبینین كە بە تەواوی شارەزای قورئان خوێندنەوە بێت.

والعز في صهوان المجد مركبه

والمجد ينتجه الاسراء والسهر

بەراستی عیززەت شكۆمەندی سوارچاكیەتی

وەشكۆمەندیش بەرهەمی شەونخونیو ڕێكردنو ماندووبوونە.

بۆیە مافی خۆمە کە بڵێم: (ما انصفنا قومنا)[٤] ئەم وتەیە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کاتێك کە لە شەڕی ئوحوددا بوونو حەوت لاوی مەدینەیی لەبەردەستدا شەهید بوون، وەئێمەیش ئەڵێین:

برا فێرخوازو بانگەوازکارە تازە پێگەیشتووەکانمان بە نوێنەر نەهاتوونەتە ئەفغانەوە، بەڵکو هەندێکیان ئامۆژگاری ئەو موجاهیدانە ئەکەن کە سەرگەرمی جیهادن، بۆ ئەوەی لە جیهاد ساردیان بکەنەوەو وەکو خۆیان دایانبنیشێنن کە ئەم دانیشتنە بە قازانجی دەسەڵاتی زاڵمان کۆتایی دێت.

هەندێکی تریان بەبێ زانست ئەڵێن: "ئەفغان پێویستی بە ماڵ و سامان هەیەو پێویستی بە پیاو نییە"، منیش لە میانەی ئەو ماوەیەی کە ڕۆژانە لە جیهاددا بەسەری ئەبەم، بۆم دەرکەوتووە کە ئەفغان پێویستی زۆر بە ماڵ هەیە، بەڵام لە ماڵ گرنگتر پێویستی بە پیاو هەیەو زیاتریش پیاوانی بانگخواز، من ئەمە ئەسەلمێنم، چونکە ئەوا شەشەم ساڵمە کە لەناو موجاهیداندا بەسەری ئەبەم[٥].

ئەگەر گومانت هەیە لەو قسەیەی کە ئەیکەم بفەرموو با بە ئەفغانستاندا بگەڕێین بچینە بەرەیەکی جەنگەوە بزانە کەسێکت دەست ئەکەوێت کە بە باشی توانای خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی هەبێت، لەگەڵم وەرە بۆ بەرەیەکی تری جەنگ بۆ ئەوەی دڵنیا بیت کە کەسێکی تیانییە بزانێت نوێژی جەنازە بکات کە ناچاریان نەکات نوێژ لەسەر شەهیدەکانیان بکەن، چونکە شەهید لە مەزهەبی حەنەفیدا نوێژی لەسەر ئەکرێت، بەڵام یاسا فیقهیەکانی سەبارەت

---

[٤] دەقی فەرموودەکە بەم شێوەیەیە: (ما أنصفنا أصحابنا). أخرجه مسلم، ١٧٨٩. واتە: لەگەڵ هاوەڵانماندا دادپەروەر نەبووین. (وەرگێڕ).

[٥] ئەمڕۆ لە هەموو ڕۆژان زیاتر موسڵمانان پێویستیان بە پیاو هەیە لە هەموو جیهاندا.......... (أليسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ) (هود: ٧٨) (وەرگێڕ).

بە جیهاد لە دابەشکردنی دەسکەوت و شێوازی مامەڵە کردن لەگەڵ گیراواندا هەر هیچی لێ نازانن لە زۆربەی بەرەکانی جەنگدا ئەم گرفتە هەیە، کە ناچاریان ئەکات بچن بۆ ناوچەکانی ترو پرسیار لە زاناو شارەزاکان بکەن بۆ ئەوەی بڕیاریان بۆ بدەن بە پێی شەریعەتی ئیسلام.

تۆ زۆر پێویستت بە کۆمەڵێك بانگخوازو پێشەوا و خوێنەری قورئان و زانا هەیە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو شوێنەوارە قووڵەوە سەریهەڵداوە کە لەبەرەکانی جەنگدا دروست بووە، کۆمەڵێك لە گەنجانی عەرەبی خاوەن ڕۆشنبیرییەکی سادە کە ڕۆشنبیرییەکەیان ناگاتە ئاستی ناوەندی، لێرەدا باسی هەندێکیان ئەکەین وەك نموونە نەك وەك دیاریکردن لەوانە (عبداللە ئەنەس، ئەبودوجانە، ئەبوعاصم[٦]، تاهیر) زۆری تریش، وە ئەگەر سەبارەت بە ئەبوشوعەیب قسەت بۆ بکەم کە کەسێکی عەرەبی نەخوێندەوار بوو لە دوای خۆی چ شوێنەوارێکی ورەبەرزی لە ویلایەتی بەغلان سەرانسەر بەجێهێشت سەرت سووڕئەمێنێت لەو دلێرییەو نەبەردیەی کە نواندویەتی.

ئێمە ئومێدەوارین لەو برایانەی کە نەیانتوانیوە لە قەفەزی خوو و نەریتی کۆمەڵایەتی دەرچن و تۆزی چاولێکەرییان لەسەر سەریانەو پاشماوەی چەرخە رووخاوەکانیان بە سەرشانەوە ماوە لە ژێر پاڵەپەستۆی واقیعی تاڵدا و لە بەرامبەر هێرشی فیلاوی ڕۆژهەڵاتدان، بەو برایانە ئەڵێم: ئەگەر خۆیان

---

٦ ئەم برایە کوردەو ناوی (محمد عثمان)ە، خەڵکی هەولێرە، هەموو قورئانی لەبەر بوو، وەلە کاتی هێرش بردندا بە زمانی بە ڕۆژووەوە شەهید بوو. (وەرگێڕ)

نەماتوون بۆ لامان هیچ نەبێت باوازبهێنن لەو كەسانەی كە رۆحیان بەسەر زەوی جیهاددا ئەفرێت یا بە لاشەیان بگەنە ئەو زەویە جیهادیە[٧].

بە قازی (مظلوم)مان وت كە یەكێك بوو لە پایەكانی ئەحمەد شاه مەسعودی سەركردە لە ئەفغانستان بەبێ نكۆلی پێمان وت سەبارەت بە ئەبوعاصم قسەمان بۆ بكە كە قورئان خوێنێك بوو لە نێو ئێوەدا لە (ئەندراب) شەهید كرا، ئەویش وتی: تاكو ئێستا هیچ كەسێكم نەدیوە وەك ئەو لە سامو هەیبەتدا، لە بێدەنگی و لە لەسەرخۆییدا، هیچ كەس لە ئێمە نەیدەتوانی لە كاتی ئامادەبوونیدا قسە بكات و قاچی درێژ بكات چ جای گاڵتە بكات یان پێ بكەنێت.

تۆ چی ئەڵێیت براكەم؟ ئەگەر هەواڵت بدەمێ كە ئەبوعاصم خاوەنی بڕوانامەی ئامادەیی بوو و تەمەنیشی لە بیست و سێ ساڵ تێنەپەڕیبوو، بەڵام قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو.

لەبەرئەوە ئامادەبوونی پیاوانە و ئەمە شوێنی كاریگەرییە بەبێ چۆنێتی بارودۆخەكە.

بەراستی كارەساتی گەورە مسوڵمانانی داگیركردووە، واز لە باسكردنی خواردن بهێنەو واز لە شێوازەكانی قسەكردن بهێنە و قسە لەسەر ئەم ئەركە بەرزە خواییە بكە كە مسوڵمانان چی بۆ پێشكەش بكات[٨].

•

---

٧ خەڵك ساردكردنەوە لە جیهاد رەوشتی مونافیقەكانە (فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرّاً لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ) (التوبة : ٨١ ). (وەرگێڕ).

٨ ئەوە كارەی شەیتانە هەمیشە دەیەوێت لە پێشترەكان (أولیات) لە موسڵمانان بگێڕێت وەك ابن قیم دەفەرموێت: (العقبة السادسة: وهي عقبة الأعمال المرجوحة المفضولة من الطاعات، فأمره بها وحَسَّنها في عينه، وزيَّنها له، وأراه ما فيها من الفضل والربح، ليشغله بها عما هو أفضل منها وأعظم

## ٣ـ لە ترسی ئاگری دۆزەخ:

خـوای گـەورەو پـەروەردگار ئەفـەرموێت: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ التوبة: ٣٩.

واتـە: ئەگـەر گشت بـەجارێك بـەرەو مەیدانی جیهـاد لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ دەرنەچـن، خـوا سـزایەکی ئـێش پێگەیەنـەرتان ئەداو دوژمنـیش زاڵ ئـەکات بەسـەرتاندا، ئێوە لا ئـەبات و خـەڵکێکی تـر ئەخاتە جێگاتـان، کە خزمـەت بە ئـایینی ئیـسلام بکـەن، نـاتوانن زەرەر بـە خـوا بگەیـەنن بـە دواکـەوتنتان لـە جیهاد، خواش بە تواناو بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا[٩].

ئیبنولعەرەبی ئەفەرموێت: (العذاب الالیم) واتـە: سزای سـەخت و بە ئێش، لـە دنیادا بریتییە لە زاڵبوونی دوژمـن، وە لـە ڕۆژی دواییشدا بریتییـە لـە ئـاگری سەختی دۆزەخ[١٠].

---

كسباً وربحاً، لأنه لمّا عجز عن تخسيره أصل الثواب طمع في تخسيره كماله وفضله، ودرجاته العالية، فشغله بالمفضول عن الفاضل وبالمرجوح عن الراجح وبالمحبوب لله عن الأحب إليه وبالمرضي عن الأرضى له ـ إلى قوله ـ وفي الحديث الآخر "الجهاد ذروة سنام الأمر" ـ إلى قوله ـ ولا يقطع هذه العقبة إلا أهل البصائر والصدق من أولي العلم، السائرون على جادة التوفيق قد انزلوا الأعمال منازلها وأعطوا كل ذي حق حقه). (العمدة في أعداد العدة، عبدالقادر بن عبدالعزيز، ص١٤). (وەرگێڕ).

[٩] ئەگەر سەیری مێژووی ئەم ئیسلام و رابوونە بکەین ئەم راستیە زۆرجار روویداوە، کە هەرکات کۆمەڵێك وازیان لە جیهاد هێنابێ خوای گەورە کۆمەڵێکی تری دروست کردووە بۆ جیهاد (ئەم دینە خوا خاوەنیەتی)!!! (وەرگێڕ).

[١٠] تەفسیری قورتوبی، ١٤٢/٨.

وەقورتووبی ئەفەرموێت: وتراوە مەبەست لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە پێویستە ئیمانداران راپەڕن بۆ جەنگو جیهاد لە کاتی پێویستداو لە ئاشکرابوونی بێباوەڕیو دەسەلاتیاندا.

خوای پەروەردگار ئەفەرمویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾ النساء: ٩٧ – ٩٩.

واتە: بەراستی ئەو کەسانەی کە مسوڵمانن، بەڵام لە ژێر سایەی دەسەلاتی بێباوەڕاندا ئەژین، ناتوانن دژایەتی لە ناڕەوا بکەن، لە کاتی سەرەمەرگیاندا فریشتەی گیانکێشان دێت بۆ لایان کە لە کاتێکدا ناهەقیو ستەمیان لە خۆیان کردووە، چونکە (دار الشرك)یان بەجێ نەهێشتو کۆچیان نەکرد پێیان ئەڵێن ئێوە لە کوێ بوونو بۆچی لێرە کۆچتان نەکردو لەگەڵ موشریکەکاندا مانەوە؟ ئەڵێن ئێمە لەسەر زەوی بێدەسەلات و لاواز کرابووین، فریشتەکانیش ئەڵێن ئایا زەوی خوا پانو فراوان نەبوو تا کۆچ بکەن بۆی؟ ئەوانە جێگایان دۆزەخە، دۆزەخیش خراپترین جێگایە. ئەو پیاوو ژنو منداڵانە نەبێ کە توانای هیچ خۆدەربازکردنێکیان نییەو شارەزای ڕێگەش نینو ڕێدەرناکەن، جا بێگومان خوا لەوان ئەبورێت، وە خوا هەمیشە گوناه پۆشی لێبوردەیە.

بوخاری لە عەکرەمەوە بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێت: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان رازی بێ) هەواڵی پێدام کە هەندێك لە مسوڵمانان لەگەڵ موشریکەکانا بوونو کۆچیان نەکردو کۆچنەکردنەکەیشیان بوو بە هۆی زیادبوونی ژمارەی

دوژمـن لەسـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ و بەشـدارییان دەکـرد لەگـەڵ لەشـکری بێباوەڕاندا کاتێك کە بەرەنگاری مسوڵمانەکان بوونەوە.

تیرێـك هـاتو دای لـە یـەکێکیانو کوشـتی (واتـە دای لـەو مـسوڵمانانەی کـە لەگەڵ کافرەکاندا بوو) بەو هۆیەوە خوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ .... ﴾ النساء: ٩٧ – ٩٩.

ئەگەر مسوڵمانان لە مەککە کۆچیان نەکردایەو بە دوای پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەکەوتنایـە، دەبوایـە لـە ڕۆژی بـەدردا بەشـدارییان لەگـەڵ لەشکری کافرانـدا بکردایـە لـە دژی مـسوڵمانان بجەنگانایـەو بەمـەش ڕەشـایی موشـریکەکانیان زیـاد دەکـرد، لـەم بەشداریکردنەشـیاندا هەنـدێکیان لـێ کـوژراو شایـستەی دۆزەخ بوون بـەپێی گێڕانەوەکـەی ئیمـامی بوخـاری، ئیتر ئـەمڕۆ چۆن بیر لـە ملیۆنەها کەس دەکەیتەوە کە بە ناو مسوڵمانن‌و ژیانێکی سوك‌و ڕیسوایان لە ژێـر دەسـەڵاتی بێباوەڕانـدا هەیە کـە بـە هـیچ شێوەیەك نـاتوانن بـەرگری لـە شەرەف‌و خوێن‌و ئابڕوو ماڵیان بکەن، بەڵکو کەسـیان نـاتوانن پارێزگـاری لـە ڕیشیان بکەن‌و بیهێڵنـەوە[11]، چونکە دیاردەیـەکی خراپـی ئیسلامییە، بەڵکو ناتوانن بە پۆشاکی شەرعی خێزانەکانیان داپۆشـن[12]، چونکە ئەمـە تاوانێکـە دەستبەجێ تۆڵەیان لێئەکرێتەوە لەسەری، وە نـاتوانن سـێ گـەنجی مـسوڵمان لـە مـاڵی خـوادا فێـری قورئـان خوێنـدنیان بکـەن[13]، چـونکە ئـەم جـۆرە کۆبوونەوانە لـە باوی نەفامیدا ناشـەرعی و نـەگونجاوە، بەڵکو لە هەندێك لـە وڵاتـی بـەناو ئیسلامیـشدا نـاتوانن قـژی ژنـەکانیان داپۆشـن[14] و نـاتوانن

---

[11]، ١٢، ١٣، ١٤، هۆ خەڵکینە....

دەزانن چی لەم ئەستێرە گەورەدا

جێی نابێتەوا:

ڕیش و سیواك!!

بەرگری لە پیاوانی دەسەڵات بکەن کاتێك کە لە نیوەی شەودا دەستی کچەکانیان دەگرن و دەیانبەن بۆ هەر شوێنێك کە بیانەوێت، کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانن فەرمانی زاڵمان رەت بکەنەوە، چونکە ئەمە فەرمانی زاڵمانە و ئەبێت ئەو کەسە بکرێتە قوربانییەکی هەرزان و تالآن لەسەر ئارەزووەکانی ئەم زاڵم و تاغوتە، جا ئایا کەس هەیە رێگری لەوە بکات؟

ئایا ئەم ملیۆنەهایە بە زەلیلی و ریسوایی ناژین، وە فریشتەکان کاتێك ئەیانمرێنێت ئەمانە زوڵم و ستەمیان لە خۆیان نەکردووە؟ جا وەڵامیان چۆن ئەبێت کاتێك فریشتەکان پرسیاریان لێ ئەکەن (فیم کنتم) واتە: لە چ بارودۆخێکدا دەژیان؟ ئایا ناڵێن: "کنا مستضعفین في الارض" واتە: لەسەرزەویدا بێدەسەڵات ئەکراین، بەراستی لاوازیو بێدەسەڵاتی جێگەی بیانوو نییە لای پەروەردگار، بەڵکو تاوانێکە خاوەنەکەی شایستەی دۆزەخ ئەکات، خوای پەروەردگار روونی کردووەتەوە کە عوزرو بەهانە لە کێ وەرئەگرێت، لە پیاوو ژن و منداڵی بێ دەسەڵات کە ناتوانن بەرەو زەوی سەروەری بڕۆن و جیهاد بکەن و بیانوویەکیان نییە کە خۆیان لەو بێدەسەڵاتییە رزگار بکەن، کەواتە ئەو کەسەی کە خاوەنی هێزەو توانای هەیە کە کۆچ بکات هیچ بیانوویەکی لێوەرناگیرێت.

---

دەرسی قورئان!!

نوێژی جەماعەتی مزگەوت!!

سەرپۆش... ئافرەتی داوێن پاك!!

هۆ خەڵکینە...

ئالەم وڵاتە بەرینە

هەموو شتێ تیای ئازادە

بەڵام ئەوەی جێگای نابێ و تیای قاجاغ بێ:

(یەکتاپەرستی)یەو (دین)ە... (شیعری: یەکبوون)، (وەرگێر)

سأصرف وجهي عن بلادٍ غدابها
لساني معقولا وقلبي مقفلا
وان صريح الحزم والراي لامريء
اذا بلغته الشمس ان يتحولا

روو لە وڵاتێك وەرئەگێرم کە زمانم تیایدا زیندانەو دڵم تیایدا کلیل دراوە، بێگومان خاوەنی راوبۆچوون کەسێکە کە ئەگەر تیشکی رۆژی پێگەیشت بگۆرێت[١٥].

بەراستی جیهادکردن و کۆچکردن بۆ جیهادکردن بەشێکی سەرەکییەو لە سروشتی ئەم ئایینە جیا نابێتەوە، ئەو ئایینەی کە جیهادی تێدا نەبێت ناتوانێت لەسەر هیچ بەشێکی زەوی خۆی رابگرێت و رەگی خۆی داکوتێت، وە رەسەنێتی جیهادکردن کە لە کرۆکی ئەم ئایینەیە وەزن و کێشی خۆی هەیە لە تەرازووی خوای پەروەردگارداو تایبەت نییە بە چەرخ و کاتی دابەزینی قورئانی پیرۆز، بەڵکو پێویستە کە هاوەڵێتی ئەم کاروانە بکات کە ئەم ئایینە رێنوێنی ئەکات[١٦].

مامۆستا (سید قطب) لە تەفسیری (فی ظلال) لە بەرگی دوو لە لاپەرە (٧٤٢) لە تەفسیری ئەو سێ ئایەتەی سورەتی (النساء)دا ئەفەرموێت: ((ئەگەر جیهادکردن شتێکی کتوپر بوایە لە ژیانی ئەم ئوممەتەداو تایبەت بوایە بە کاتێکی دیاری کراو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا خوای پەروەردگار لە قورئاندا ئەوەندەی باس نەئەکرد و چەند بارەی نەئەکردەوە بەو شێوازانەی کە هاتووە! هەروەها لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ زۆر جەختی لەسەر نەئەکرایەوە بەو شێوازانەی کە هاتووە.

---

[١٥] موسڵمان نابێ دەستەوسان و لاواز بێ (ولا تعجز.... حدیث)، بەڵکو دەبێ هەمیشە ئامادەباش بێ‌و لە فرسەت بگەرێ. (وەرگێر).

[١٦] (لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة) مسلم، (وەرگێر).

ئەگەر جیهادکردن شتێکی کتوپڕ بوایە و تایبەت بوایە بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، ئەوا ئەم وشەیەی نەئەفەرموو بۆ هەموو تاکێکی مسوڵمان تاکو ڕۆژی دوایی (من مات ولم يغز ولم يحدث نفسه بالغزو مات على شعبة من النفاق) رواه مسلم عن أبي هريرة.

واتە: ئەگەر هەر کەسێك بمرێ و جیهادی نەکردبێت و بە نیازی جیهادکردنیش نەبووبێت لە بیرو هۆش و دڵیدا ئەوا ئەو کەسە لەسەر بەشێك لە دووڕوویی و مونافیقی مردووە.

خوای پەروەردگار ئەزانێت کە ئەم جیهاد کردنە پاشایان و دەسەڵاتداران رقیان لێیەتی! وە ئەزانێت کە دەسەڵاتداران بەربەرەکانی ئەکەن، چونکە پێچەوانەی ئارەزووەکانیانەو لەگەڵ پرۆگرامەکانیاندا ناگونجێت، ئەمە نەك هەر لە کۆنەوە وابوو بێت، بەڵکو ئەمڕۆیش وایەو دواتریش وائەبێت لە هەموو بەشێکی ئەم زەوییەو لە هەموو سەردەمێکدا[17].

وە خوای پەروەردگار ئەزانێت کە شەڕو خراپەکاری لە هەڵکشاندایە، ناگونجێت لە بەرامبەر خێردا دادگەربێت، بەڵکو نایەڵێت کە خێرو چاکە لە گەشەکردندا بێت[18]، بەهەر ڕێگەیەکیش بێت کە بیانووی ئەو شەڕو ئاشوبەیە بگرێت، چونکە بەس بە گەشەکردنی خێرو چاکە زەرەر ئەخاتە

---

[17] لەم ڕۆژگارەدا هەرکەس باسی جیهادو بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاران و بێ باوەڕان بکات راستەوخۆ بە ئیرهابی و تیرۆریست ناوی دەبەن!! وە ئەگەر بێتو بیکاتە کردار (واتە چەك هەڵگرێت) ئەوا بە درندەترین شێوە سەرکوتی دەکەن و بەناو مافی مرۆڤیش خۆی لێ بێدەنگ دەکات (چونکە مافی مرۆڤ و دیموکراتی قسەی کاربەدەستان و لافیتەی سەر دیوارەو بەهیچ شێوەیەك موسڵمانان ئەو مافەیان پێ نادرێت)!!! (وەرگێڕ).

[18] کە خێرو چاکە گەشە بکات لە هەر جێگایەك ئەوا خراپەکاری جێگەی نابێتەوەو بەرەو تیاچوون دەچێ. (وەرگێڕ).

سەر ڕێگەی شەڕو ئاشوب، وە بە دەرکەوتنی ڕاستی ناڕاستی پووچەڵ ئەبێتەوە، کەواتە ئەبێت شەڕو ئاشوب بەرگری لە خۆی بکاتو باڵی درێژ بکات بە هەوڵدانی بۆ کوشتنی ڕاستیو خنکاندنی!

ئەمە سروشتە! شتێکی کاتی نییە.

ئەمە خواڕسکە! شتێکی کتوپڕ نییە.

کەواتە جیهاد پێویستە.... بەهەموو شێوازێك ئەبێت ئەنجام بدرێت، دەبێت پێش هەموو شتێك لە دەروونەوە دەست پیٚ بکات، پاشان ئاشکرا بکرێت، بۆ ئەوەی لە جیهانی ڕاستیو واقیعدا بەرپا بکرێت... ئەگەر شەڕ چەکی پیٚ بوو ئەبێت بە چەکی خێر لێی بدرێت[١٩]... وە ئەبێت بەرەنگاری ژمارەی پڕچەکی باتڵ و ناڕەوا بە ئامادەکردنی حەقو ڕاستی هێز بکرێت، ئەگەرنا ئەوکات کارەکە بەرەو خۆکوشتن ئەڕوات، یان ئەبێت بە شتێکی گاڵتەجاڕی کە شایستەی بڕواداران نییە)).

ان لا الوم المستبد اذا تجبر او تعــــدا

فسبيله ان يستبد وشأننا ان نستعدا

لۆمەی چەوسێنەر ناکەم ئەگەر زوڵمی کرد، چونکە ئەوە پیشەیەتی، وە لەسەر ئێمەیش ئەوەیە کە خۆمان ئامادە بکەین[٢٠].

---

[١٩] (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ) (البقرة: ١٩٤) . (وەرگێڕ).

[٢٠] (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ) (الأنفال: ٦٠) عوقبەی کوڕی عامر خوای لیٚ ڕازی بێت دەفەرموێت، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە سەر مینبەر دەیفەرموو: "(وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ) ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي". رواه مسلم. (العمدة في اعداد العدة، عبدالقادر بن عبدالعزيز، ص٢١). (وەرگێڕ).

## ٤. وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوای پەروەردگار(٢١)

خوای پـەروەردگار ئەفـەرموێت: ﴿ٱنفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾﴾ التوبة: ٤١.

واتـە: گـشتان بـە سـوكو قورسـتانەوە، بـە پـیرو گەنجتانـەوە، دەرچـنو بـە مـاڵو سامانو گیانتان لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن، ئەمە بۆ ئێوە چاکەو قازانجە ئەگەر بیزانن.

ئیمـامی قورتـوبی لـە تەفسیرەکەیدا لـە بـەرگی (٨) لاپـەڕەی (١٥٠) بۆ وشـەی (خفافاً وثقالا) دە واتاو راڤەی هێناوە:

١. ئیبن عەباس بە واتای گەنجو پیر لێکی داوەتەوە.

٢. ئیبن عەباسو قەتادە بە چالاك و سست لێکیان داوەتەوە.

٣. موجاهید ئەفـەرموێت: (الخفیـف) بـەواتای دەوڵەمەنـد دێـت و (الثقیل) بـە واتای فەقیر دێت.

٤. حەسەن ئەڵێت: (الخفیف) واتە گەنج، (الثقیل) واتە پیر.

---

٢١ لــە تەفــسیری ئایــەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ .... ﴾ الأنفال: ٢٤، (الواحیـدی) دەفـەرموێت: "زۆربینـەی زانایـان لەسـەر ئـەوەن کـە مانـای (لما یحییکم) جیهادە، ئەمەشیان وتەکەی (ابن اسحاق)ە، کە زۆرێك لە زانایان ئەم رایەیان هەڵبـژاردووە، (الفراء) دەفەرموێ: هەر کاتێك خوای گەورە بانگی کردن بـۆ ژیـان ئـەوە فـەرمانتان پـێ دەکـات بـە جیهاد کە بجەنگن لە دژی دوژمنانتان، دەیەوێت بەم جیهادە بەهێزتان بکات، بەڵام ئەگەر وازیـان لـە جیهاد هێنا ئەوە بێ هێز دەبنو دوژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێتو تێکیان دەشکێنێت.

(ابن قیم) دەفەرموێت: منیش دەڵێم: جیهاد پلەیەکی زۆر بەرزە ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت لـە دنیـاو بەرزەخو دوارۆژدا. (ناوێتەی دڵ — الفوائد/ ابن قیم الجوزیة)، (وەرگێڕ)

٥ـ زەیدی کوڕی عـەلی و حەکـەمی کـوڕی عوتەیبـە ئەفـەرمون: بـە واتـای سەرقاڵکەرو بیّ ئیش دێت.

٦. زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەفەرموێت: (الثقیل) واتە خێزاندارو (الخفیف) واتە بیّ خێزان.

٧. ئیبن زەید ئەڵێن (الثقیل) بە کەسێك ئەوترێ کە کارو پیشەیەکی هەبێت و پێی ناخۆش بێت وازی لیّ بهێنێت، (الخفیف) بە کەسێك ئەوترێ کە ئیشی نەبێت.

٨. ئەوزاعی ئەفەرموێت: (الخفاف) واتە پیادەو (الثقال) واتە سوار.

٩ـ (الخفاف) بـەو کەسـانە ئـەوترێت کـە ئەکەونـە پێـشەوەی مەیـدانی شـەڕ. (الثقیل) بە سوپاکە ئەوترێ.

١٠. النقاش ئەڵێت: (الخفیف) بە واتای ئازاو چاونەترس ئەوترێت، (الثقیل) بە واتای ترسنۆك دێت.

ئەوەی راست و دروستە لە مانای ئایەتەکەوە ئەوەیە کە ئەوەیە کە خـەڵکی بـە گشتی فەرمانیان پێکراوە، واتە: ڕاپەڕن ئیتر جوڵەو ڕۆیشتنیان لەسەر ئاسان بێـت یـان گـران، ئەگێڕنـەوە کـە ئـیبن مـەکتوم هـات بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ و فەرمووی: ئایا جیهاد و غەزام لەسـەر واجبە؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: بـەڵێ تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴾ النور: ٦١ واتە: کوێر هیچ نارەحەتییەکی لەسەر نییە ئەگەر نەڕوات بۆ جیهاد، بۆ زانین ئیبن مەکتوم واتە عبداللەی کوڕی مەکتوم هاوەڵێکی کوێری پێغەمبـەری خوا ﷺ بوو[٢٢].

---

[٢٢] کاتێك پێشەوا عومەر خوای لیّ رازی بیّ ویستی سوپا بنێریّ بۆ شام، (ابـن ام مکتـوم)یـش خـوای لیّ رازی بیّ خۆی ئامادەکرد، عومەر خوای لیّ رازی بیّ پێی وت: تۆ خوای گەورە عوزری داویّتیّ کە

گومانی تێدا نییە ئەو بارودۆخەی کە ئێمەی تێدا ئەژین لە ئەفغانستان‌و فەلەستین بگرە لە زۆربەی شوێنی جیهانی ئیسلامی دەقی ئەم ئایەتە ئەیگرێتەوە.

ڕاڤەکارانی قورئان‌و زانایانی فەرموودەناس‌و شەرعزانان‌و ئوسوڵزانان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئەگەر دوژمن چووە ناو زەوییەکی ئیسلامیی یان ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو زەوییە بوو بە خاکی ئیسلام‌و وڵاتی مسوڵمانان ئەوا لەسەر دانیشتوانی ئەو شوێنەیە بچن بە گژیانا و شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر دانیشتن یان کەمتەرخەمییان کرد یان تەمبەڵییان کرد یان نەیانتوانی ئەوا پێویستە دەوروبەریان ئەو شەڕە بکەن، ئەگەر ئەوانیش کەمتەرخەمییان کرد یان دانیشتن لەسەر خەڵکانی پشت ئەوانیشە کە ئەو شەڕە بکەن، ئەگەر ئەوانیش نەیانکرد لەسەر کەسانی دەوری ئەوانیشە تاکو وای لێدێت هەموو مسوڵمانان لەسەریان ئەبێت بە فەرزی عەین‌و ئەبێت جیهاد بکەن هەروەك چۆن نوێژو ڕۆژوو جێبەجێ ئەکەن. بەشێوەیەك فەرز ئەبێت کاتێك کوڕ ئەچێت بۆ ئەو جیهادە پێویست ناکات فەرمان لە باوکیەوە وەربگرێت بۆ ئەوەی بڕوات یان نەڕوات، وە پێویست ناکات قەرزار فەرمان لە قەرزدەرەکەی وەربگرێت، وە ژن فەرمان لە مێردەکەی وەربگرێت‌و بەندە فەرمان لە گەورەکەی وەربگرێت، ئەم فەرزی عەینە بەردەوام ئەبێت تاکو شار لە پیسی

---

ئەچیت، وتی: کوڕی خەتاب دەتەوێت ڕێی شەهادەتم لێ بگری؟! عومەر وتی: باشە دەچی چیدەکەیت لەگەڵیان؟ وتی: ئەچم ژمارەیان زیاد دەکەم، کاتێك چوو لەگەڵیان ڕازی نەبوو لە دوای دواوە بوەستێ، بەڵکو داوای کرد کە ئاڵاکەی بدەنە دەستی‌و لە ناوەڕاستی گوڕەپانی جەنگدا بێت و وتی: من بۆ ئەمە چاکم، چونکە چاوم نییە بترسم و ڕا بکەم! بەڵێ، پاش جەنگەکە بینییان ئاڵاکە بە باوەشێوەیەتی و بۆ خوا شەهید بووە و زەردەخەنەش لەسەر لێویەتی!. (بەرەو ئیسلام، هیمەت بەرزی، ئەندازیار عوسمان، ل٢١). (وەرگێڕ).

بێبـاوەڕان پـاك ئەبێتـەوە (بـەڵام ئـافرەت ئـەبێت لەگـەڵ مـەحرەمێکی دەربچێت)[٢٣].

بەو ئەندازە کەمەش کە هەمە لە خوێندنەوە هیچ کتێبێکی (فیقهی و تەفسیر و حەدیس)م بەرچاو نەکەوتووە کە دانی بەوەدا نەنێ جیهاد (فەرزی عەینە) لەم حاڵەتانەی کە باسمان کرد، وە هیچ کەس لە (سەلەف) نەیانوتووە ئەم حاڵەتە فەرزی کیفایەیە یان پێویستە ئیزن لە دایكو باوك وەربگریت، وە تاوان لە کۆڵ مسوڵمانان ناکەوێت تا ئەو کاتەی پارچەیەك لە زەوی مسوڵمانان کە پێشتر مسوڵمانانی تێدا بوون بە دەستی بێباوەڕانەوە بمێنێت جگە لە موجاهید کەس لەو تاوانە رزگاری نابێت.

ئـەمڕۆ هەرکـەس واز لـە جیهـاد بێنێـت ئـەوە فـەرزێکی تـەرك کـردووە وەکـو کەسێك وایە کە بەبێ بەهانە رۆژووی مانگی رەمەزانی شکاندبێت، یان وەکو دەوڵەمەندێك وایە زەکاتی ماڵی دەرنەکات، بەڵکو وازهێنەری جیهاد لەوە تاوانی سەختترە[٢٤].

هەروەك ئیبنو تەمییە رەحمەتی خوای لێ بێت ئەفەرموێت: (العدو الصائل الذي يفسد الدين والدنيا ليس أوجب بعد الايمان من دفعه).

واتە: دوژمنی داگیرکەرو خۆسەپێن کە دەستدرێژی ئەکاتە سەر ئایینو ژیان لەوکاتەدا دوای باوەڕهێنان هیچ شتێکی تر لەسەر مسوڵمانان فەرز نییە بۆ بەرگری لێکردنی و دژایەتی کردنی.

---

[٢٣] لە کتێبی (العمدة في اعداد العدة، عبدالقادر بن عبدالعزيز) جوان ئەم حوکمەی روون کردووەتەوە. (وەرگێڕ).

[٢٤] چونکە بە جیهاد نەبێ حاکمیەتی خوا ناگەڕێتەوە و خەڵکی ئازاد نابن، وەگەر موسڵمانان خاوەنی وڵاتی خۆیان نەبن ناتوانن بە ئازادانەش پەرستشەکان بە تەواوەتی بکەن، بۆ نموونە (تونس لە کاتی حوکمڕانی زين العابدين بن علي)دا لەم چەند ساڵەی فەرمانڕەوای بوو. (وەرگێڕ).

کاتێك ئەبوتەڵحە ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾ التوبة: ٤١، فەرمووی: مەبەست پێی گەنج و پیرە خوا بیانووی هیچ کەسی نەهێشتووە، پاشان فەرمووی: (ئەی کوڕەکانم ئامادەمکەن بۆ جیهاد و پێداویستییەکانی جیهادم بۆ ئامادە بکەن، کوڕەکانی وتیان ڕەحمەتی خوات لێ بێت تۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ جیهادت کردووە هەتا کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا جیهادت کرد هەتا کۆچی دواییان کرد، ئێمە لە جیاتی تۆ جیهاد ئەکەین، ئەبوتەڵحە فەرمووی: نەخێر ئامادەمکەن بۆ جیهادو پێداویستی جیهادم بۆ ئامادە بکەن. ئینجا جیهادی کرد، سەرەنجام لەناو دەریادا کۆچی دوایی کرد و هیچ وشکانییەکیان دەست نەکەوت تاکو تیایدا بینێژن تا دوای حەوت ڕۆژ نەبێت، پاشان شاردیانەوەو هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات و لاشەکەی تێکنەچوو (خوای لێ ڕازی بێت).

قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا لە بەرگی (٨) لاپەڕە (١٥١) دا ئەفەرموێت: (ئەگەر جیهاد فەرزبوو بە هۆی زاڵبوونی دوژمن بەسەر بەشێك لە وڵاتی مسوڵمانان یان دوژمن چووە ناو خاکی نیشتمان ئەو کاتە لەسەر خەڵکی وڵاتە دەربچن بۆ جیهاد کردن بە گەنج و پیرەوە بەپێی تواناو پێویستیش بەرەزامەندی وەرگرتنی دایك و باوك ناکات).

نابێت هیچ کەس دوابکەوێت ئەگەر توانای دەرچوونی هەبێت لەشەڕکەر یان لەوانەی کە ژمارەی مسوڵمانان زیاد ئەکەن، ئەگەر خەڵکی ئەو شارەیان ئەو وڵاتە توانای بەرەنگاربوونەوەی دوژمنیان نەبوو ئەوا دەبێت مسوڵمانە نزیك و دراوسێکانیان یارمەتیان بدەن، تاکو بزانن کە توانایەکیان هەیە یارمەتیان بدەن و بەرگرییان لێ بکەن.

هەروەها هەركەس بە لاوازییان بزانێت‌و بزانێت كە پێیان ئەگات واجب ئەبێت لەسەر ئەو كەسە بەهانایانەوە بچێت، چونكە مسوڵمانان هەموویان یەك دەستن لەسەر غەیری خۆیان، خۆ ئەگەر خەڵكی ناوچەیەك كە دوژمن داباریوەتە سەریان‌و داگیری كردوون هەستان بە بەرگری كردن لە دوژمن ئەوكات فەرزەكە لەسەر خەڵكانی تر لائەچێت.

ئەگەر دوژمن نزیكی وڵاتی مسوڵمانان كەوتەوە، بەڵام نەچووبووە ناوی، پێویستە ئەو مسوڵمانانە بچن بە گژ دوژمندا، تاكو دینی خوا سەربكەوێت‌و سپیایی مسوڵمانان بپارێزرێت‌و دەستكەوت‌و داراییان بپارێزرێت‌و دوژمن ریسواو سەرشۆڕ بكرێت، ئەمە هیچ نكولی و جیاوازییەكی تێدانییە.

نابیغە ئەلجەعدی چەند جوانی وتووە كاتێك خێزانەكەی ئەدوێنێ‌و خێزانەكەیشی حەز ئەكات لەناویاندا دانیشێت و ئەویش ئەڕوات بۆ جیهاد:

باتت تذكرني بالله قاعـــــدة

والدمع يهطل من شانيهما سبلا

يا بنت عمي كتاب الله أخرجني

كرها وهل أمنعن ما فعلا

فإن رجعت فرب الخلق ارجعني

وإن لحقت بربي فابتغي بدلا

ماكنت اعرج او اعمى فيعذرني

أو ضارعاً من ضني لم يستطيع حولا

واتە: شەوی كردەوە دانیشتوویەك سوێند بە خوا یادم ئەكات، وە فرمێسك وەكو باران لە هەردوو رێگەكەیەوە دێتە دەرەوە، ئەی كچی مامم كتێبی خوا (قورئان) دەری كردووم، بەدەستی خۆم نییە، ئایا بەرگری لە شتێك بكەم كە خوا كردوویەتی، ئەگەر گەڕامەوە ئەوە لە خواوەیەو ئەگەر گەیشتیشم بە

خوای خۆم ئەوا تۆیش بە دوای کەسێکی تردا بگەڕێ لە دوای من، من شەل و کوێر نیم تا بەهانەم هەبێت کە نەڕۆم یان نەخۆشێکی وا نیم کە نەتوانم هیچ بکەم.

## ٥ـ بۆ شوێن پێهەڵگرتنی پێشینە باشەکان (السلف الصالح)[٢٥]:

بەراستی جیهاد خوو نەریتی پیاوچاکانی پێشوو بووە، وە پێغەمبەر ﷺ پێشەوای موجاهیدان بووە، پێشەوای مەردانی ناو مەیدان بووە، ئەگەر شەڕ گەرم بوایە، دەوروبەری پێغەمبەریان ﷺ دەگرت، چونکە پێغەمبەر ﷺ زۆر لە دوژمن نزیك ئەبووەوە، لە موجاهیدان زیاتر لە دوژمن نزیکتر ئەبووەوە، ژمارەی ئەو غەزایانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەشداری تێدا کرد بیست و حەوت غەزا بوو، وە لە نۆ دانەیاندا شەڕی تێدا کردووە، ئەوانیش: (بەدر، ئوحود، ئەلمورەیسیع، خەندەق، قورەیزە، خەیبەر، فەتحی مەککە، حونەین، تائیف) ئەمە لەسەر وتەی ئەو کەسەی کە ئەڵێن مەککە بە جەنگ فەتح کرا.

وەئەو سرییەیانەی کە ناردوونی چل و حەوت سریە بوون، هەندێك ئەفەرمون پێغەمبەر ﷺ بەشداری مەیدانی شەڕی بەنونەزیری کردووە[٣٦].

ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو دوو مانگێکدا یان کەمتر بەشداری غەزای کردووە، یان سریەیەکی ناردووە، هاوەڵە بەرێزەکانیش خوایان لێ رازی بێت لە پاش پێغەمبەر ﷺ هەمان سوننەتیان جێبەجێ

---

[٢٥] یونسی کوڕی عبید (رەحمەتی خوای لێ بێ) قوتابی ئەنەسی کوڕی مالیك خوای لێ رازی بێ خەریکی بازرگانی کردن بوو، لەسەرەمەرگدا سەیری قاچی خۆی دەکرد و دەستی کرد بە گریان، کەس و کارەکەی لێیان پرسی: باوکی (عبدالله) بۆچی دەگریت؟ ئەویش وتی: بۆ ئەوە دەگریم کە پێم تۆزی جیهادی لێ نەنیشت لە دنیادا. (لە گوڵزاری پیاوچاکاندا، سەردار عبدالرحمن، ل٢٤٧). (وەرگێڕ).

[٣٦] نهاية المحتاج، ١٦/٨.

کردووە، لە راستییدا قورئانی پیرۆز ئەوانی بەشێوەیەك پەروەردە دەکرد کە هەموو کات ئامادەی جیهاد بن و گیان لەسەر دەست بن بۆ پاراستنی ئایینی ئیسلام، وە ئەوەی هیچ کات بە بیریاندا نەدەهات ژیانی دنیاو دنیاپەرستی بووە[٢٧].

حاکم لە کتێبی (المستدرك) بەرگی (٢)، لاپەرە (٢٧٥)دا لە ئەسلەمی کوڕی عیمرانەوە بۆمان ئەگێڕێتەوە: پیاوێك لە کۆچکەران لە شەڕی قوستەنتینیە هێرشی بردە سەر دوژمن هەتا لە ناویاندا ون بوو، ئەبو ئەیوبی ئەنساریشمان لەگەڵ بوو، خەڵکەکە گوتیان ئەو مسوڵمانە بە دەستی خۆی خۆی خستە ناو تالوکەو تیاچوونەوە، ئەبوئەیوب فەرمووی: من لە ئێوە زاناترم لەبارەی ئەو ئایەتەوە کە باسی تیاچوون ئەکات ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥. چونکە ئەو ئایەتە لەبارەی ئێمە هاتووەتە خوارەوە، ئێمە هەموو کات لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووین بە ماڵو گیان بەبێ وچان لە جەنگو جیهاددا تا ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاشکرا بوو بڵاوبوویەوە، رۆژێك ئێمەی کۆمەڵی یارمەتیدەر لە نێو خۆماندا کۆبووبووینەوە سوپاسی خوامان دەکرد لەسەر ئەوەی رێزی لێ گرتینو کردینی بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ هەتا ئایینی ئیسلام دەرکەوت و خەڵکی لێ کۆبووەوە، ئەوجا ئێمە ساردبووینەوەو وازمان لە جیهاد هێناو وتمان با بگەڕێینەوە بۆ لای ماڵو

---

[٢٧] خالیدی کوڕی وەلید خوای لێ رازی بێ دەفەرموێت: هیچ شتێ لە دوای (لا اله الا الله) ئەوەندەی شەوێکی ساردو توندی سەهۆڵ بەندان ئاواتە خوازنیم کە لە ناو سریەیەکی موهاجریندا بمو ئاسمان بە لێزمە داکاتو منیش چاوەڕێی بەیانی بکەم تاکو هێرشی تیا بکەمە سەر کافران، ئامۆژگاریتان دەکەم بە جیهاد. (لە گوڵزاری پیاوچاکاندا، سەردار عبدالرحمن، ل٤١). (وەرگێڕ).

منداڵ، ئینجا خوای كاربەجێ ئەم ئایەتەی بۆمان ناردە خوارەوە: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥.

كەوابوو واتای بە هیلاك چوون لە ئایەتەكەدا، دانیشتن‌و خۆشویستنی ماڵ‌و منداڵ‌و پشتگوێخستنی خەبات‌و جیهادە.

"عەكرەمە" بۆمان دەگێڕێتەوە كە (ضمرة بن العيص) كە یەكێك بوو لە هەژارەكانی مەككەو نەخۆش بووە كاتێك كە بیستی ئایەت لەبارەی كۆچككردنەوە هاتە خوارەوە فەرمووی: دەرمكەن لە شاری مەككە، شێوە تابووتێكیان بۆ دروست كردو خستیانە ناوی‌و لە مەككە دەرچوو، لە رێگادا لە ناوچەی "التنعيم" (٦ كم لە شاری مەككەوە دوورە)، كۆچی دوایی كرد[٢٨].

"طبري" لەو كەسەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە (مقداد بن الاسود)ی لە (حمص) دیتبوو لەسەر تابووتێك كە خۆی بۆ جیهاد ئامادە كردبوو، پێیان گوتبوو: تۆ چاوپۆشیت لێ كراوە، گوتی: ئایەتی ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا ﴾مان بۆ هاتووەتە خوارەوە....

"زهری" دەڵێ: (سعيد بن المسيب) دەرچوو بۆ غەزایەك چاوێكیشی نەمابوو، پیان گوت: تۆ چاوت تەواو نییە، گوتی: (استنفروا الله الخفيف والثقيل) خوای گەورە داوای راپەڕین لە پیرو گەنج‌و سست‌و چالاك‌و هەموو خەڵك بە گشتی دەكات... گوتی: ئەگەر توانای جەنگیشم نەبێ خۆ ژمارەی سوپاكەمان زۆر دەبێ و دوژمن زیاتر دەترسێ، یان چاودێری كەرەستەو شتەومەكی سوپا دەكەم.

وە دەگێڕنەوە هەندێ كەس لە غەزای شامدا پیاوێكیان دیتبوو كە پێڵووەكانی بەسەر چاویدا درابووەوە لەبەر پیری‌و تەمەن زۆری، پێیان گوت:

---

[٢٨] تەفسیری قورتوبی، بەرگی ٥، لاپەرە ٣٤٩.

مامە تۆ خودا چاوپۆشی لێ کردوویت، گوتی: کاکی برای خودا فەرمانی پێ داوین کە راپەڕین بە پیرو گەنجەوە[٢٩].

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم کاتێ هەستی بەوە کرد کە مردنی نزیک بووەتەوە، گوتی: با کەوانەکەم تیرێکی تیا بێت، ئەوجا گیانی سپارد، لە یەکێك لە دورگەکانی ولاتی رۆمدا بە خاك سپێردرا[٣٠].

(عبداللەی کوڕی موبارەك) (٢٦٠٠) کیلۆمەتر رێگەی بە سواریو بە پیادە بڕیوە و جەنگاوە لە پێناوی رێگای خوادا[٣١].

"زوهەیری کوڕی قومەیری مەروزی" دەیفەرموو: ماوەی (٤٠) ساڵ بوو ئارەزووی گۆشتم دەکرد، نەم خوارد هەتا چووینە خاکی رۆمەوە لە دەستکەوتی ئەو شەڕەدا خواردم[٣٢].

"قازی کوفە، عەروەی کوڕی جەعد" لە ماڵەکەیدا (٧٠) ئەسپی دابەستەی ئامادەی جیهادی هەبوو[٣٣].

وە ئەوە "محمد بن واسع"ە کە یەکێك بووە لە پیاوچاکە هەمیشە ئیشکگرەکان، (قتیبە بن مسلم الباهلی) لە بارەیەوە دەڵێت: تەنها پەنجەیەك کە موحەممەدی کوڕی واسیع درێژی بکات بۆ ئاسمانی گۆڕەپانی جیهاد لەلام خۆشترە لە هەزار شمشێرو جەنگاوەری پاڵەوان[٣٤].

---

[٢٩] تەفسیری قورتوبی، ب (٨) ل١٥١.

[٣٠] مێژووی دیمەشق لابن عساکر بەرگی ٢ لاپەرەی ١٧٩٠.

[٣١] عبدالله بن المبارك، د. المحتسب.

[٣٢] ترتیب المدارك للقاضي عیاض، بەرگی٣، ل٢٤٩.

[٣٣] تهذیب الاسماء واللغات، بەرگی١، ل٢٣١.

[٣٤] المشوق ف الجهاد.

ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی سولەمی دەفەرموێت: لێم ڕوونە کە بەم شمشێرەم هەزار کافرم لە تورکان کوشتوون، ئەگەر پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبوایە[٣٥]، (واتە ئەگەر بیدعە نەبوایە) فەرمانم دەدا کە شمشێرەکەم لەگەڵدا بنێنە گۆڕەوە.

ئەبو عبداللەی کوڕی قادوس هێندەی لە گاوران کوشتووە ئەگەر گاورێك ویستبای ئەسپەکەی ئاو بخواتەوە و ئەسپەکەی نزیك ئاوەکە نەکەوتبا دەیگوت: بۆ ئاوەکەت ناخۆیتەوە خۆ ـ إبن قادوس ـ لە ئاوەکەدا نییە[٣٦]؟!!

وە ئەوە (بدر بن عمار)ە کە بە دارەکەی شێرێك دەکوژێ.

أمعفر الليث الهزبر بسوطه

لمن ادخرت الصارم المصقولا

ئەی ئەو کەسەی کە بە دارەکەت شێرەکەت لە خۆڵا گەوزاندو کوشتت، باشە ئەی شمشێرە تیژەکەت بۆ کێ هەڵگرتووە.

(غراسیانی) کە سەرکردەیەکی ئیتالیە، دەڵێت: "عمر موختار" ٦٣ جار لەگەڵ سەربازەکانی ئێمەدا جەنگاوە، بەڵام کۆی هەموو شەڕەکانی دەکاتە هەزار شەڕ.

ئینگلیزەکان لە شاری (إسماعیلیە) دا لە سەربازگەکانیاندا حاڵەتی ترسناکیان ئاشکرا دەکرد، چونکە (محمد فرغلی[٣٧]) هاتبووە نێو شارەکەوە،

---

[٣٥] تهذيب التهذيب لإبن الحجر، بەرگی ١/ ١٤.

[٣٦] المشوق فى الجهاد.

[٣٧] یەکێکە لە بانگخوازە موجاهیدە تێکۆشەرەکانی میصر، کە هەمیشە سیمای ئەدەبو عیززەتو شارەزایی تێدا رەنگی داوەتەوەو خاوەن تێگەیشتنێکی گەورەو زمانێکی پاراوو دڵێکی پڕ لە رێزو خۆشەویستی بووە بەرامبەر هاوکارو برایانی. (من إعلام الدعوة والحركة الاسلامية المعاصرة، عبدالله عقيل)، (وەرگێڕ).

ئینگلیز (٥٠٠٠) جونەیهی دەدا بەو کەسەی کە سەری (فرغلی) یان بۆ بهێنێت به زیندوویی بێ یان به مردوویی.

"یوسف طلعت" لەبەرئەوەی لە (قناة السویس) دا زۆری لە ئینگلیزەکان کوشتبوو ناونرا (جزار الانكلین)، جمال عبدالناصر لەبەر رەزامەندی ئەمریکا له سێدارەی دا، (محمد بەنا)و کۆمەڵەکەی له گوزەری (سالانج) دا چوار سەد ئامرازی گواستنەوه (ناقلات)یان سوتاند، رووسەکان نازناوی (جەنەڕاڵ)یان پێبەخشی، هەروەها دووسەد کلاکوف و دوو سەد کلاشنکۆفی به غەنیمەت گرتبوو، هەروەها موحەممەد بانا بۆی گێڕامەوه کە جارێکیان سەدو پەنجا تانك و ئامرازی گواستنەوەی به جارێك سووتاندووه.

عبدالله ئەنەس بۆی گێڕامەوه: جارێکیان کۆمەڵی لە رووسەکان چاویان پێی دەکەوێ (به موحەممەد بەننا) له ترسا هەندێکیان تفەنگەکە له دەستیان دەکەوێ.

## ٦- بۆ پێکهێنان و بەرپاکردنی بنکەیەکی پۆڵاینی ئیسلامی[٣٨]:

بەرپاکردنی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان لەسەر رووی زەویدا کارێکی گرنگ و پێویستە بۆ مسوڵمانان، وەك چۆن ئاو و هەوایان پێویستە، ئەو بنکەیەش پێك نایەت به بزووتنەوەیەکی ئیسلامی رێك و پێك نەبێت و جیهاد دروشم و مەبەستی نەبێت و خوێن بەخشین و شەهیدی ئاواتی نەبێت... وە ئەو بزووتنەوه ئیسلامییەش ناتوانێ - خواش دەزانێ - ئەو کۆمەڵگایە پێك بێنێ ئەگەر به خەباتێکی میللی گشتی نەبێ و پێشمەرگەکانی هەست و نەستیان و لێدانی دڵیان و بیرو هۆشیان بزووتنەوەکە نەبێت، چونکە

---

[٣٨] پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دروست کرد لە مەدینەدا و کردی بە بنکەیەکی جەماوەری، به جیهاد به سەروماڵ ئەم دەوڵەتەیان پاراست و هەمیشە لەوێوە سوپاو مەفرەزەکان دەردەچوون بۆ جەنگ و زەبروەشاندن. (وەرگێڕ).

بزووتنـەوەی ئیـسلامیی دەبێتـە هـۆی تەقینـەوەی وزەی شـاردراوەی گـەل‌و هەڵقوڵانی کانی خێرو چاکە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ژمارەیان زۆر زۆر کەم بوو لە چاو ژمارەی ئەو موسڵمانانەی کە دەستیان بەسەر کیسرادا گرت‌و تەخت‌و تاجی قەیسەریان سەرنگوم کرد...

ئـەو هۆزانـەی کـە لـە سـەردەمی ئەبوبـەکردا (خـوای لـێ رازی بێـت) پاشگەزبووبوونەوە، پاش ئەوەی کە گەڕانەوە بۆ سەر ئیسلام حەزرەتی عومەر - خوا لێی رازی بێ - رای پەڕاندن‌و ناردنی بۆ کوشتاری فارسەکان، وە "طلعة بن خويلد الاسدي" کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد، بوو بە یەکێك لە پاڵەوانە ناودارەکانی قادسیەو "سەعد" هەڵیبژارد بۆ ئاشکراکردن‌و هەواڵ هێنانی فارسەکان، بەڵام ئەو برە ئەفسەرەی کە خەڵکی بێ ئاگا گومانیان پێ دەبەن کە دەتوانن کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دروست بکەن ئەوە خەیاڵ و خەوێکە نایەتە دی، چونکە کارەساتە دڵتەزێنەکانی "جمال عبدالناصر" بەرامبەر بزووتنەوەی ئیسلامیی جارێکی دی لە یاد ناکرێت.

رێگای جیهاد و خەبات رێگایەکی دوورو درێژو پڕ دڕك‌و داڵە، قوربانیدانی زۆری دەوێ، ئەشکەنجەو ئازاری زۆری تیادایە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا دڵ‌و دەروون‌و مـشتومال دەکـات و پـاکی دەکاتـەوە، وە رزگـاری دەکـات لـە خۆشویستنی ماڵ‌و سامان‌و رق‌و کینە لە ناو دڵدا ناهێڵێت و کاروانی خەبات لە نزمییەوە بەرەو لوتکە دەبات[٣٩]. لەگەڵ دوورو درێژی رێگای جیهاددا سەرکردایەتی پاڵفتە دەبێت و لێهاتوویی لە کاتی قوربانیداندا دەردەکەوێت و ئازایەتی و خۆبەختکردنی پیاوان ئاشکرا دەبێت[٤٠].

---

٣٩ (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا) (العنكبوت: ٦٩)، (وەرگێڕ).

٤٠ (وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ) (آل عمران: ١٤١)،

ما أكثر الاخوان حين تعدهم      ولكن في النائبات قليل (جواهر البلاغة) (وەرگێڕ).

هەرچەند مسوڵمان خۆی لە بۆتەی خەباتدا قاڵ بکات ورەی بەرز دەبێتەوە و کاری گەورەو گرنگ ئەنجام دەدات و دەبێتە جێگەی ئومێدی گەلان[٤١].

ولا تحسبن المجد زقاً وقينة     فما المجد إلا الحرب والفتكة البكر

وادامەنێن کە عیززەت و سەربەرزی بریتییە لە گۆرانی و مۆسیقا، بەڵکو عیززەت بریتییە لە شەڕو کوشتار.

وە شاعیرێکی تر دەڵێت:

إذا غامرت في شرف مروم
فلا تقنع بما دون النجوم
فطعم الموت في أمر حقير
كطعم الموت في أمر عظيم
يرى الجبناء ان الجبن عقل
وتلك خديعة الطبع اللئيم

ئەگەر تۆ گیانی خۆتت خستۆتە ترسەوە بۆ ئامانجێك کە دەتەوێ پێی بگەی، دەی بە شتی کەم و بێ مانا رازی مەبە، وە ئەوەش بزانە کە مردن لە پێناو شتی گەورەو بچوکدا هەر یەکە (مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی لە پێناوی شتی گەورەدا بداتە کوشت)[٤٢].

جا ترسنۆکەکان ترسنۆکی خۆیان بە ئاقڵی تێ دەگەن، نازانن ئەوە فرۆفێڵی دەروونە پیسەکانە، سروشتی کۆمەڵ وەکو ئاو وایە، ئاوی وەستاو و نەبزواو قەوزە دەیگرێ و بۆن دەکات، بەڵام ئاوێك لە رۆشتندا بێت نە قەوزە دەیگرێ

---

[٤١] قال الشيخ بن باز رحمه الله: "من نذر نفسه لخدمة دينه فسيعيش متعبا ولكن سيحي كبيرا ويموت كبيرا ويبعث كبيرا". (والحياة في سبيل الله أصعب من الموت في سبيل الله). (وەرگێڕ).

[٤٢] حەسەنی بەصری (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێت: نەفسی تۆ بەنرخە، بە بەهەشت نەبێ مەیفرۆشە). (لە گوڵزاری پیاوچاکاندا، سەردار عبدالرحمن، ل٢٠٦). (وەرگێڕ).

و نە بۆن دەکات[٤٣]، هەروەها ئەگەر ئەندامەکانی کۆمەڵ بە گشتی و ئەوانەی کە جڵەوی سەرکردایەتییان بەدەستە بەتایبەتی، سست و دانیشتووبوون، ئەوا رابەرایەتی لە نێوانیاندا دروست نابێت، چونکە رابەرایەتی و سەرکردایەتی ئەنجامی تێکۆشان و قوربانی دان و خوێن دانە[٤٤].

"ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی" خودایان لێ رازی بێت ناوبانگیان دەرنەدەکرد ئەگەر هەوڵ و تێکۆشان و قوربانیدانی خۆیان نەبوایە.

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە پاش خۆی ئەبوبەکری کردە جێنشین و ئیدی پێویستی بە هەڵبژاردن نەکرد، چونکە ئەبوبەکر پێش ئەوەی ببێتە جێنشین لە ژیانی رۆژانەیدا سەلماندبووی کە شیاوی ئەوەیە ببێتە رابەری مسوڵمانان. ئەو نەتەوەیەی کە تێدەکۆشێ و جیهاد دەکات دەبێ بە لایەوە ئاسان بێت کە بەنرخترین شتی ببەخشێت، چونکە چنینی بەری پێگەیشتووی شیرینی درەختی جیهاد سووک و ئاسان نییەو جێگەی خۆیەتی ئەگەر ئەو دارە بە عارەقی نێو چاوان و و خوێنی دڵ پەروەردە بکرێت[٤٥].

بەڵام ئەوانەی کە سواری سنگی خەڵکی دەبن لە ئەنجامی کودەتایەکی سەربازییەوە، بەلایانەوە ئاسانە کە هەموو شتێك لە دەست بدەن و وڵات بدەن بە دەستەوە.

ومن اخذ البلاد بغير حرب

يهون عليه تسليم البلاد

---

[٤٣] قال أبوبكر الصديق لخالد بن وليد رضي اله عنهما: (احرص على الموت توهب لك الحياة). (وەرگێڕ).

[٤٤] قال د. عبدالله عزام (رحمه الله): (إن مقادير الرجال تبرز في ميادين القتال والنزال لا في منابر الأقوال). (وەرگێڕ).

[٤٥] قال د. عبدالله عزام (رحمه الله): (علمني الجهاد إن الاسلام شجرة لا تعيش إلا على الدماء). (وەرگێڕ).

ئەو نەتەوە خەباتگێڕو تێکۆشەرەی کە پیاوانی بێ وێنەو لێهاتوو رابەرایەتی دەکاتو ئەو پیاوانەش کە بەرهەمی خەباتێکی دووری درێژ بن، زاڵ بوون بەسەر ئەو نەتەوەیەدا ئەستەمەو ئاسان نییە، وە هێزی دوژمن ناتوانێ کڵپەی ئاگری جیهادی ئەو سەربازانە بکوژێنێتەوە کە پەروەردەکراوی قوتابخانەی جیهادو خەباتن و سەنگەریان گرتووەو گیانی خۆیان بەخت دەکەن لە پێناوی بەدی هێنانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی و دەبنە پاسەوانی ئەو کۆمەڵگا لەدایك بووەی کە هەموو نەتەوەکە ئازارو ژانی چێشتووە لە پێناویدا.

هەردەبێ کۆمەڵگای ئیسلامی لە دایك ببێو هەردەبێ لە دایکبوونیش ژانی لەگەڵدا بێو ژانیش ئازارو ئەشکەنجەیە.

## ٧- پاراستنی مافی چەوساوەکانی سەر رووی زەوی:

یەکێك لە بەرهەمەکانی جیهاد پاراستنی مافی چەوساوەو زۆرلێکراوانە لەسەر رووی زەویداو لابردنی ستەمو جەورو زۆرداربیە لەسەریان.

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾ النساء: ٧٥.

پەروەردگاری بە بەزەیی بە گلەیی و سەرزەنشتەوە روومان تێدەکاتو دەفەرموێ: ئەوە چیتانە بۆ ناجەنگێن لە رێگای خوادا بۆ بەرزکردنەوەی دروشمی "لا الـه الا الله محمد رسول الله" وە لە پێناوی چەوساوانو زۆرلێکراوانو ژێردەستاندا، لە پیاوانو ئافرەتانو منداڵان، ئەوانەی کە بە دەنگە کپە زوڵاڵەکەیان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان رزگارمان بکە لەم ئاواییە کە خەڵکەکەی زۆردارو ستەمکارن، وە لە لایەن خۆتەوە سەرپەرشتیکەرو

یارمەتیدەرێکمان بۆ بڕەخسێنە، هەر لە لایەن خۆتەوە یەکێکمان بۆ بڕەخسێنە کە سەرمان بخات.

کیف القرار وکیف یهدأ المسلم

والمسلمات مع العدو المعتدی[٤٦]

مسوڵمان چۆن دەتوانێ دانیشێ و ئارامبگرێت و ئافرەتانی مسوڵمان کەوتوونەتە لای دوژمن؟؟!!

زانایانی (فقە) هەموو لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین بەگیان و بە ماڵ کاتێك کە ئافرەتێکی مسوڵمان دیل بکرێت "ئەگەر ئافرەتێك لە ڕۆژهەڵاتدا دیل کرابێت پێویستە لەسەر مسوڵمانانی ڕۆژئاوا هەوڵی ڕزگارکردنی بدەن"[٤٧].

فلیهتم اذا لـــم یذودوا حمیة

عن الدین ضنوا غیرة بالمحارم

وان زهدوا الأجر إذا حمي الوغي

فهلا اتوه رغبة فـي المغانم

خۆزگە ئەوانە غیرەتی پارێزگاری لە دین رای نەپەڕاندن، پارێزگاریان لە شەرەفی خۆیان بکردایە، وە ئەگەر وازیان لە پاداشت هێنابوو دەبا بۆ غەنیمەت بهاتنایە[٤٨].

---

٤٦ عبدالله بن مبارك (سیر اعلام النبلاء ـ الذهبي) ٨/٤١٦.

٤٧ با نەزانانە لۆمەی ئەو برایانە نەکەین کەوا زمانی هێز بەکاردێنن بۆ ئازادکردنی ئەو خوشکە مسوڵمانانەی کە لە لای قیبتیەکانی میصر بەند کراون، یان لە تۆڵەکردنەوەی بکوژانی (دوعا)دا. (وەرگێڕ).

٤٨ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ) (التوبة : ٣٨ ). (وەرگێڕ).

جارێکیان لەگەڵ حیکمەتیاردا بووم لە ولایەتی (لوگر) لە ئەفغانستان، کاتێک کە بۆردومانێکی توندی شارەکە کرا، پاشان منداڵانی شارەکە هاواریان لێ هەڵساو ژنەکان دوعایان بۆ حیکمەتیار دەکرد.

أتسبى المسلمات بكل ثغر — وعيش المسلمين إذن يطيب

أمـــا الله والإسـلام حق — يدافع عنه شبان وشيب

ژیـانی مـسوڵمان کـەی خۆشـە کاتـێ کـە ئافرەتـانی مـسوڵمان وەك (سـەبایا) ببرێن، وە ئایا خوای گەورە و ئیسلام ئەوەندەیان ماف نییە کە پیرو گەنج بەرگری لێ بکەن.

ئاییەنی ئیسلام هات بۆ ئەوەی دادپەروەری لە سەر زەویدا جێگیر بکات ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾ الحديد: ٢٥. واتە: ئێمە پێغەمبەرانمان (عليهم الصلاة والسلام) ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ئاشکراوە و لەگەڵیاندا کتێب و تەرازوومان نارد، واتە قورئانمان ناردە خوارەوە کە یاساو پرۆگرامی خوایەو یاسایەکی دادپەروەرانەیە بۆ ئەوەی خەڵکی هەڵسن بە ئەنجامدانی دادگەری و دادپەروەرانە هەڵسوکەوت بکەن.

## ٨ـ بە ئومێدی گەیشتن بە پلەی شەهیدی‌و شادبوون بە پایەی بەرز لە بەهەشتدا[٤٩]:

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: "للشهيد عند الله سبع خصال، يُغفر لهُ في اول دفعة من دمه، ويرى مقعده من الجنة، ويحلى حلة الإيمان، ويزوج اثنين

[٤٩] عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ:( اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (وەرگێر).

وسبعين زوجة من الحور العين، ويجار من عذاب القبر، ويؤمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار، الياقوتة منه خير من الدنيا وما فيها، ويشفع في سبعين إنسان من أهل بيته"[٥٠].

لە لايەن خواوە بۆ شەهيد حەوت خەسڵەتان هەيە:

١. لەگەڵ دەرچوونی یەکەم دڵۆپی خوێن لە لەشی، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.

٢. شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێت.

٣. بە نیشانە جوانەکانی باوەڕ دەرازێنرێتەوە.

٤. ٧٢ حۆری بێ وێنە دەکرێت بە هاوسەری.

٥. رزگاری دەبێ لە سزای گۆڕ.

٦. پارێزراو دەبێ لە کارەساتەکانی رۆژی زیندووبوونەوە.

٧. تاجی سەرفرازیو شکۆمەندی دەخرێتە سەر سەریو تکای لێخۆشبوون لەلای خوای گەورە دەکات بۆ ٧٠ کەس لە خزمو کەسوکاری.

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم الله فسألوه الفردوس"[٥١].

لە بەهەشتدا سەد پلە هەن، خوای گەورە بۆ ئەو موجاهیدانەی ئامادەکردووە کە لە رێگای خوادا دەجەنگن، نێوان هەردوو پلەیەك وەك نێوانی ئاسمانو زەوی وایە ئەگەر ئێوە داواتان کرد لە خوا بۆ یەکێك لەو پلانە (فیردەوس) داوا بکەن کە بەرزترین پلەو شوێنەواری بەهەشتە.

[٥٠] رواها أحمد والترمذي عن المقداد مرفوعاً ـ صحيح الجامع ، رقم الحديث ٥٠٥٨.

[٥١] فتح الباري، بەرگی ٦، ل٩.

### ٩ـ جیهاد پارێزگاری لەسەربەرزیو شکۆمەندی گەلو کۆمەڵ دەکات، زەلیلیو سەرشۆڕییان لەسەر لادەبات:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "إذا ظن الناس بالدينار والدرهم وتبايعوا بالعينة واتبعوا اذناب البقر، سلط الله عليهم ذلاً لا يرفعه عنهم حتى يراجعوا دينهم"[٥٢].

واتە: هەرکات مەبەستی سەرەکی خەڵك کۆکردنەوەی پارەو پوول بوو، بەخیلیو چرووکیان لە خۆیاندا دروست کرد، وە شوێن کلکی مانگا کەوتن، واتە خوویان دایە ئاژەڵداریو کشتوکاڵو وازیان لە جیهاد هێنا، خوای گەورە زەلیلی و داماوییان بەسەردا دەسەپێنێت، لای نابات لەسەریان هەتا نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی ئیسلام.

### ١٠ـ جیهاد پارێزگاریکەری هێزو توانای نەتەوەیەو بەرپەرچدەرەوەی فروفێڵی دوژمنانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴿٨٤﴾﴾ النساء: ٨٤. (پێشتر تەفسیر کراوە)

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "يوشك أن تداعى عليكم الأمم من كل افق، كما تداعي الأكلة الى قصعتها. قيل: يا رسول الله امن قلة نحن يومئذ؟ قال: لا بل انتم كثيرون، ولكنكم غثاء كغثاء السيل. ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة وليقذفن في قلوبكم الوهن. فقيل: وما الوهن؟ قال: حبكم للدنيا

[٥٢] حديث صحيح، رواه أحمد عن ابن عمر مرفوعا، صحيح الجامع، ٦٨٨.

وکـــراهيتكم للمـــوت". وفي روايـــة صـــحيحة: "حـــبكم للـــدنيا وكـــراهيتكم للقتال"[٥٣].

واتە: لەوانەیە کۆمەڵانی دوژمن لە هەموو لایەکەوە دابارنە سەرتان، هەروەك چۆن کۆمەڵێ برسی دادەبارنە سەر خوانێ، گوترا: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا لەبەر کەمیمانە لەو ڕۆژەدا؟ فەرمووی: نا لەبەر کەمیتان نییە، بەڵام ئێوە وەکو کەف سەر ئاو وان لە زۆریدا، ترس و بیم دەچێتە دڵتانەوە و ترس و سامی ئێوە لە دڵی دوژمنانتاندا نامێنێت لەبەر خۆشویستنی ژیانی دونیاو بوغزاندنی مردن. لە ڕیوایەتێکی تردا (لەبەر خۆشویستنی ژیانی دونیاو بوغزاندنی کوشتار).

## ١١- جیهاد دەبێتە هۆی چاك کردن و پاککردنەوەی سەرزەوی و پارێزگاری کردن لە فەساد:

پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ ﴿٢٥١﴾﴾ البقرة: ٢٥١.

واتە: ئەگەر خوا هەندێ کەس بە هەندێکی دی پاڵ پێوە نەنێ و لەناو نەبات، سەرزەوی پڕ دەبێت لە فەسادو پشێوی و ئاشووب.

## ١٢- جیهاد پارێزگاری دروشمەکانی ئایینی ئیسلام دەکات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿٤٠﴾﴾ الحج: ٤٠.

واتە: ئەگەر خوای گەورە هەندێ کەسی خراپکار بە هەندێ لە موجاهیدان لەناو نەبردباو پاڵی پێوە نەنابا، پەرستگا گۆشەگیرەکانی گاورو جولەکەو دێرو

---

[٥٣] سلسلة الصحيحة، ٩٥٨.

کەنیسەکان و مزگەوتەکانی مسوڵمانان دەڕووخێندران و کاول دەکران، کە یادی خودایان زۆر تیادا دەکراو پەرستشیان تیادا ئەنجام دەدرا.

## ١٣ـ جیهاد گەل‌و نەتەوە دەپارێزێ لە سزای سەختی ئەم دونیاو دوارۆژ وە لە گۆڕان و تێکدانیان دەپارێزێ:

﴿إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ...﴾ التوبة: ٣٩. (لە خاڵی (٣)دا تەفسیر کراوە).

## ١٤ـ جیهاد دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوون‌و زۆربوونی بەروبووم‌و دارایی خەڵك

"وجعل رزقي تحت ظل رمحي"[٥٤].

خوای گەورە رزق‌و رۆزی منی خستۆتە ژێر سێبەری تیرەکەمەوە.

## ١٥ـ جیهاد لوتکەی هەرەبەرزی ئیسلامە:

"وذروة سنامه الجهاد"[٥٥]. جیهاد گۆشەنشینی مسوڵمانانە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "وعليك بالجهاد فإنه رهبانية الإسلام"[٥٦]. جیهادو خەبات بکەن، چونکە جیهاد کەنارنشینی مسوڵمانانە.

---

[٥٤] حديث صحيح، رواه أحمد عن ابن عمر، صحيح الجامع، ٢٨٢٨.

[٥٥] حديث صحيح عن معاذ.

[٥٦] حديث حسن، رواه أحمد في المسند، ج٣، ل٨٢ عن أبي سعيد الخدري.

## ١٦ـ جیهاد باشترین‌و گەورەترین پەرستش‌و بەرزایەتییە[٥٧]:

چونکە بە هۆی جیهادەوە مسوڵمانان دەگەنە بەرزترین پلە.

"فضلی کوڕی زیاد" دەفەرموێت: بیستم لە (أبا عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) باسی دوژمنی دەکرد دەستی کردە گریان‌و فەرمووی: لە کردەوە چاکەکاندا هیچ کردەوەیەك ناگاتە جیهاد، چونکە ئەوانەی کە جیهاد دەکەن، ئەوانەن پارێزگاری خاك‌و ئاوی مسوڵمانان دەکەن‌و شەووڕۆژ لە سەنگەردان و ژیانیان لە خۆ حەرام کردووە لە پێناوی ئیسلامداو لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار.

[٥٧] قال شيخ الاسلام ابن تيمية (رحمه الله): إن الجهاد أفضل من الحج والعمرة ومن التعبد في المسجد الحرام الذي تعدل صلاة فيه مائة ألف صلاة في غيره من المساجد، وقد استدل على ذلك بقوله تعالى (أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (التوبة: ١٩) (العمدة في اعداد العدة، عبدالقادر بن عبدالعزيز، ص١٢). (وەرگێڕ).

# بەندی دووەم

## هاوار بۆ ئیسلام

مسوڵمانان! پیرۆزترین سڵاوی خواتان لێ بێ... لێتان شاراوە نییە ئەو قوربانیو خوێندانەی کە فەرزکرا بەسەر گەلی ئەفغانی مسوڵماندا، هەتا ئێستا وا (٩) ساڵ و چەند مانگ تێپەڕی بەسەر کودەتاکەی (نور تراقی الشیوعی)دا لە نیسانی ١٩٧٨دا، لەوکاتەوە مسوڵمانانی ئەفغانستان شانیان داوەتە بەر ئەرکێك کە لە وزەی مرۆڤدا نییە بۆ پارێزگاری کردنی ئایینەکەیانو ماڵو منداڵیان و کەسایەتیان، هیچ ماڵێکی ئەفغانی نەماوە کە لێی نەمردبێ.

بەراستی گەلی موجاهیدی ئەفغانی - بە تەرمەکانیان لە مەیدانی جەنگدا - عوزریان بۆ خودا هێنایەوە.

لەم ماوە دوورو درێژەدا گەلی ئەفغان بە هیوای برا مسوڵمانەکانیان بوون کە بێن بە هاواریانەوەو هێزیان بکەنە یەك... بەڵام حەیفێ... نەك هەر نەبوون بە دەمیانەوە بەڵکو گوێیان لە ئاست ناڵەی پیرو پەککەوتانو قیژەی کۆرپەو ساوایانو هاوارو زریکەی ژنان کەڕبوو... هەندێ لە پیاوە باشەکان بەناردنی هەندێ لە پاشماوەی خواردەمەنی خۆیان ئەرکی سەرشانیان بەجێ هێنا!!!

بەڵام کار زۆر لەوە گەورەترو ترسناکترە... چونکە مسوڵمانان لە ئەفغاندا لە حاڵێکی زۆر ناخۆشدانو ترسی لەناوچوونیان لێ دەکرێت.

جیهاد لە ئەفغان لەسەر دەستی کۆمەڵە گەنجێك بەرپا بوو کە بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردە کرابوون، وە لەسەر دەستی کۆمەڵە زانایەك کە گیانی خۆیان بە خودا بەخشی بوو، بەڵام بەرەی یەکەم زۆربەیان رێگەی شەهیدییان گرتەبەر، بەرەی دووەم هاتنە پێشێ، بەڵام ئەم بەرەیە،

وەك پێویست پەروەردە نەكرابوون، بۆیە پێویستیان بە یەكێ هەیە كە لە نێوانیاندا بژی و بیانبەستێ بە خوداوەو پاشان بە یاسای خواوەو بە شەریعەتەوە.

وە ئێمە بەپێی ئاگاداری و زانستی كەمی خۆمان لەو بڕوایەداین كە جیهاد ئەمڕۆ لەم كاتە ناسكەی ئەفغانستاندا (فرض العين)ە بە گیانو بە ماڵ هەروەكو زانایانی هەر چوار (مذهب)ەكە بڕیاریان داوە بەبێ جیاوازی، وە لێكۆڵەرەوانی قورئانو زانایانی حەدیس و فیقە لەگەڵیاندا هاوڕان... (ابن تيميه) رەحمەتی خوای لێ بێ لە كتێبی (الفتاوی الكبری) دا ٦٠٨/٤ دەفەرموێت: (وإذا دخل العدو بلاد الإسلام فلا ريب انه يجب دفعه على الأقرب فالأقرب إذ بلاد الإسلام كلها بمنزلة البلدة الواحدة وأنه يجب النفير إليه بلا إذن والد ولا غريم ونصوص أحمد صريحة بهذا).

واتە: هەركات دوژمن چووە نێو خاكی مسوڵمانانەوە، بێگومان پێویستە مسوڵمانان بەرەنگاری بن، چونكە خاكی مسوڵمانان و وڵاتیان یەك پارچەیە و جودانابێتەوە، لەم كاتەشدا پرس بە بابو قەرزدەری ناوێ.

هەروەها لە (مجمع الفتاوی)دا ب٢٨ ل٣٥٨ دەفەرموێ: (فَإِذَا أَرَادَ الْعَدُوُّ الْهُجُومَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَإِنَّهُ يَصِيرُ دَفْعُهُ وَاجِبًا عَلَى الْمَقْصُودِينَ كُلِّهِمْ وَعَلَى غَيْرِ الْمَقْصُودِينَ لِإِعَانَتِهِمْ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: "وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ").

واتە: ئەگەر دوژمن ویستی هێرش بكاتە سەر مسوڵمانان، بەرگری كردن لێی دەبێتە فەرزو پێویست لەسەر ئەو مسوڵمانانەی كە هێرشیان بۆ كراوەو لەسەر مسوڵمانانی دیكەش وەك خوا دەفەرموێ: (ئەگەر داواتان لێكرا كە ئایینی خودا سەربخەن و بیپارێزن دەبێ سەری بخەن).

پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی داوە بە یارمەتیدانی مسوڵمان لە كاتی هێرشی دوژمندا، ئیدی هەر دوژمنێك بێتو بەهەر ناوێكەوە بێت، دەبێ هەموو

مسولمانێك بەرەنگاری بکات، بەپێی توانای خۆی بە گیان و بە ماڵ، بە کەمی و بە زۆری بە سواری بێت یان بە پیادە، وەکو کاتێك کە مسولمانان هێرشیان کرایە سەر لە شەڕی (الخندق)دا، مسولمانان بە گشتی بەشدارییان کرد، چونکە خودا رووخسەتی کەسی نەدا بەشداری نەکات... وە لەم بارەیەوە دەقی قسەی زانایانی هەر چوار رێبازەکە روون و ئاشکرایەو ناشاردرێتەوە.

"ابن عابدين الحنفي" لە حاشیەدا ب٣٠، ل٣٨، دەفەرموێ: (جیهاد فەرزی عەینە ئەگەر دوژمن هێرش بکاتە سەرگۆشەیەك لە وڵاتی ئیسلام، هەروەها دەشبێتە فەرزی عەین لەسەر ئەو مسولمانانەی کە لە گۆشە هێرش بۆ کراوە، کە نزیکن، بەڵام لەسەر ئەوانەی کە لە دواوەن و لێیەوە دوورن فەرزی کیفایەیە، ئەگەر پێویستیان پێیان نەبوو، ئەگەر پێویستیان بەوانەی دواوە هەبوو بۆ یارمەتیدانیان بە هۆی بێدەسەڵاتی و دەستەوسانی ئەوانەی کە هێرشیان بۆ کراوە یان لەبەر سستی و تەمبەڵییان لەسەر ئەوانیش دەبێتە فەرزی عەین، وەك نوێژو ڕۆژوو، ناشبێ وازی لێ بهێنن، ئیدی بەم شێوەیە هەتا لەسەر هەموو مسولمانان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەبێتە فەرز...).

هەر بە وێنەی ئەم دەقە ئاشکراو درەوشاوەیە لە (البحر الرائق)دا ب٥، ل٧٢وە (ابن الهمام) لە (فتح القدير)دا ب٥، ل١٩١، فەتوایان داوە: "بۆ زیاتر ئاگاداربوون سەیری ئەم کتێبانە بکە: (حاشية الدسوقي المالكي، ب/٢، ل١٧٤. نهاية المحتاج للرملي الشافعي ب/٨، ل٥٨. المغني لابن قدامة الحنبلي، ب/٨، ل٣٤٥).

جا لەوانەیە هەندێك کەس بیانوو بۆ خۆیان بهێننەوەو بڵێن: بەشێکی زۆری ئەفغان لە ئاستێکی ئیسلامی باشدا نین لە پەروەردەکردندا ئەوجا ئەمەیان کردووە بە بیانوو بۆ دانیشتن!.... بەڵام ئێمە بەرپەرچی ئەوە دەدەینەوە؟

چونكە بە پێی بڕیاری (فقهاء) جیهاد كردن دروستە با لەگەڵ كۆمەڵە سەربازێكی زۆر فاجیریشدا بێت... ئەمەش لە بنچینەكانی پەیڕەوانی پێغەمبەر ﷺ كە (الغزو مع كل برّ وفاجر) جیهادكردن بە هاوسەنگەرێتی لەگەڵ هەموو چاك و خراپێكدا"، بەڵێ خوای گەورە پشتگیری ئەم ئایینە دەكات، بە پیاوێكی خراپیش بێت یان بە چەند نەتەوەیەك كە ڕەوشتی ئیسلامیان تێدا نییە، ئەمەش ویستی خودا بووە بۆ ئیسلام لە سەرەتاوە هەتا ئەوڕۆ، لە كۆن و نوێدا، وە ئەمەش پێویستی و ئەركی سەرشانی هەموو مسوڵمانێكە: (وعدم الغزو مع الأمراء (ولو كانوا فجارا ) أو مع عسكر كثيري الفجور هو مسلك الحرورية –من فئات الخوارج– وأمثالهم ممن يسلك مسلك الورع الفاسد الناشيء عن قلة العلم)[٥٨].

واتە: نەكردنی جیهاد لەگەڵ فەرمانڕەوایاندا – با خراپكاریش بن – یان لەگەڵ كۆمەڵە سەربازێكدا كە زۆر خراپكار بێت، پەیڕەوی كردنی ڕێگای "الحرورية"یە (تاقمێك بوون لە خەواریج)، ئەوڕۆش هەندێ كەس گەرەكیانە بە ڕێگای ئەواندا بڕۆن و ئەو ڕێڕەوە نوێ بكەنەوە لە كەم زانستیاندا.... هەندێ خەڵك بیانوو بۆ خۆیان دێننەوە كە گوایا دانیشتنیان لە وڵاتی خۆیاندا زۆر پێویستە بۆ پەروەردەو فێركردن، ئێمەش ئەم قسەیەی (الزهری)یان دەخەینەوە یاد: "سعيد بن المسيب" چوو بۆ جیهاد لەگەڵ ئەوەشدا چاوێكی ناتەواو بوو، پێیان گوت: تۆ چاوت تەواو نییە، گوتی: (استنفروا الله الخفيف والثقيل) ئەگەر نەتوانم بجەنگم، ئەوا ژمارەی سوپاكەمان زۆر دەبێت، یان چاودێری كەرەسەتەو شتەومەكی شەڕ دەكەم... چ كەسێك پلەوپایەی، كرداری، دەگاتە گەورەیی شوێنكەوتووان (تابعين)و

---

[٥٨] (مجموع الفتاوى لابن تيمية ٢٨–٥٠٦).

میراتگری زانیاری پێغەمبەرێتی "سەعیدی کوڕی مسیب)؟ ئەبوهورەیرە خوا لێی ڕازی بێت خەزووری سەعید بووە، بۆیە زانیاری زۆری لێوەرگرتووە.
هەڵبەتــە پــەروەردەو فێرکــردن کــاری پــیرۆزنو مــسوڵمان هــەردەبێ پەروەردەیەکی ئیسلامی هەبێت، بەڵام هەموو شتێك لە کاتو سنوورێکی گونجاودا، لافاوی جەورو ستەم هەستا، مسوڵمانان زوڵمیان لێکرا، بەرەو زیندان بران، ئافرەتە مسوڵمانەکان ئابڕوویان تکێندرا، هەستیان بریندار کرا، ئیدی هەتا کەنگێ خۆگرتن؟ هەتا کەنگێ ڕانەپەڕین؟ مەگەر زانایان فەتوایان نەداوە: "ئەگەر ئافرەتێك لە ڕۆژهەڵاتدا دیل بکرێت، دەبێ مسوڵمانانی ڕۆژئاوا هەوڵی دەربازکردنی بدەن".
ئەدی ئەوڕۆ زانایانمان چ دەڵێن بەرامبەر بە هەزاران ئافرەت کە لە تەمەنی گەنجیدانو هاواریان لێ هەڵساوە بۆ شەرەفو ئابڕوویان؟ یان وەڵامیان چییە بەرامبەر بەو ئافرەتانەی کە لە تاو دەستدرێژی سەربازە سوورەکانی رووس بۆ سەر ئابڕوویان، خۆیان دەهاونە رووباری (کوین)ەوە لە (لغمان)... خۆ هەموو زانایانیش لەسەر ئەو بڕیارەن کە ئەگەر ئافرەتێکی مسوڵمان دیلی دەستی کافران بوو، ترسی هەبوو لە ئابڕووی، دەبێ خۆی نەدا بە دەستەوە، ئەوڕۆ لەوەو بەیانی لە تۆ، پێشەوای خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ: (ما من امريء يخذل امرءا مسلما في موطن ينتقص فيه من عرضه و ينتهك فيه من حريته إلا خذله الله تعالى في موطن يحب فيه نصرته و ما من احد ينصر مسلما في موطن ينتقص فيه من عرضه و ينتهك فيه من حرمته إلا نصره الله في موطن يحب فيه نصرته)[٥٩].

واتە: هەرکەس واز لە یارمەتیدانی برا مسوڵمانەکەی بێنێ لە کاتی مەترسیدا یان لە کاتێکدا کە سەربەستی و ئازادی پێشێل کرابێت، خوای گەورەش دەستی یارمەتی لێ دوور دەخاتەوە لە کاتێکدا کە زۆری پێ خۆشە یارمەتی بدرێت، وە هەرکەس یارمەتی برا مسوڵمانەکەی بدات لە کاتی مەترسی و تەنگانەدا، لە کاتی دەستدرێژی کردندا بۆ سەر ئابڕووی، ئەوا خوای گەورە دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکات لە کاتێکدا کە زۆری پێ خۆشە یارمەتی بدرێت.

(حەببانی کوڕی موسا) دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو موبارەك دا پێکەوە دەچووین بۆ شام، سەیرم کرد خەڵکەکە هەریەکەیان سەرگەرمی کارێکن، یەکێ خەریکی پەرستشەو یەکێکی دی خەریکی خۆئامادەکردنە بۆ جیهاد، ئیبنو موبارەك رووی لێکردم و فەرمووی: "إنا لله وإنا اليه راجعون على أعمارا فنيناها وليال وأيام قطعناها في علم (الخلية والبرية) كنايات الطلاق، وتركناها هنا أبواب الجنة المفتوحة".

واتە: بەڵاو موسیبەت بوون ئەو شەوو رۆژانەو ئەو تەمەنانەی کە لە زانستی تەڵاقدا بەسەرمان دەبردن، وە وازمان لە دەرگاکراوەکانی بەهەشت هێنابوو.. ئەمە ئەو ئیبنو موبارەکەی کە لەساڵێکدا دوو مانگ یان زیاتر وازی لە جیهاد نەدەهێنا، ئەو دوو مانگەش تەنها بۆ بازرگانێتیەکەی و وەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەگریا لەبەرئەوەی کە هەموو تەمەنی لە جیهاددا بەسەرنەبردووە[٦٠]... ئەدی ئەوانەی لە ژیانیاندا گوللەیەکیان

[٦٠] (فضيل کوڕی عیاض) زانایەکی خوناس بوو کە بە (عابد الحرمين) بەناوبانگ بوو، (ئیمام مالیك)یش خەریکی (فقه) و وانەوتنەوە و فەتوادان بوو، (عبدالله ی کوڕی موبارەك)یش (رەحمەتی خوا لە هەموویان بێ) خەریکی جیهاد بوو لە سنووری خەلافەتی ئیسلامیدا، (فضیل) نامە بۆ ئەو

ئاڕاستەی دوژمن نەکردووە لە پێناوی خوادا چ دەڵێن؟؟!! لە کاتێکدا کە پێشەوای خۆشەویستمان ﷺ لە ئازارو ئەشکەنجەی مردندا بوو، هەر لە یادی ئەوەدا بوو کە ئوسامە بنێرێت بۆ بەرەکانی شەڕ، لە کاتێکدا کە

---

دوو پایەبەرزە دەنێرێ‌و داوایان لێدەکات کە ئەوانیش بێن خەریکی خواپەرستی بن لەلای کەعبەو خۆیان سەرقاڵی شتی تر نەکەن.

ئەوانیش وەڵامی ئەدەنەوەو (عبدالله ی کوڕی موبارەك) چەند دێرە هۆنراوەیەکی بۆ دەنێرێ کە تیایدا باسی گەورەیی جیهادو فەزڵی تۆزو خۆڵی خەبات دەکات، کە رێگرە لە چوونە ناو دۆزەخ‌و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يا عابدَ الحرمينِ لو أبصرْتنا | لعلمتَ أنكَ في العبادة تلعبُ |
| مَن كانَ يَخضبُ خَدَّهُ بِدموعهِ | فَنحورنا بِدمائنا تَتَخضبُ |
| أوكان يُتعِبُ خَيلَهُ في باطلٍ | فَخُيولُنا يَوم الصَّبيحةِ تَتْعبُ |
| رِيحُ العَبيرِ لكم ونَحنُ عَبيرُنا | رَهجَ السَنابِكِ وَالغُبارُ الأطيبُ |
| ولَقد أتانا عَنْ مَقالِ نَبينا | قَولٌ صَحيحٌ صادقٌ لا يكذبُ |
| لا يَستوي غُبار خيلِ الله في | أنْفِ امرىءٍ وَدُخانُ نارٍ تلهبُ |
| هذا كِتابُ الله ينطقُ بَيننا | ليس الشَهيدُ بميتٍ لا يكذبُ |

هەروەها (ئیمام مالیك)یش نامەیەکی بۆ دەنوسێ لە وەڵامدا و پێی دەڵێت: (ئەی ئیمام خوا تەوفیقت بدات، بەراستی خوای پەروەردگار خۆی رزق‌و رۆزی دابەش کردووە، رزق‌و رۆزیش تەنها پارەو سامان نییە، کەسی وا هەیە بەخشینی لا خۆشەویست کراوەو دەبەخشێت، کەسی وا هەیە جیهادی لا خۆشەویست کراوەو جیهاد دەکات، کەسی واش هەیە عیبادەتی لا خۆشەویست کراوەو عیبادەتی زیاتر دەکات، کەسی تریش هەیە فێرکردن‌و تەدریسی لا خۆشەویست کراوەو حەزی ئەو کارەی هەیە، جا (وکل میسر لما خلق لە)).(سینە، ئەندازیار عوسمان، ل٨-٩). (ابن کثیر) لە تەفسیری کۆتایی سورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: کاتێك (أبی سکینە) ئەم نامەیەی (إبن مبارك)ی دا بە فضیل لە مزگەوتی (الحرام) دا، فضیل پاش خوێندنەوە گریاو فەرمووی: باوکی عبدالرحمن راستی فەرموو وە ئامۆژگاری کردم، پاشان فەرموودەیەکی پێدا لەبری گەیاندنی ئەم نامەیەدا. (وەرگێڕ).

ئەبوبەكر (خوا لێی رازی بێت) هەوڵی دا كە ئوسامە بنێرێت، هاوەڵان ویستیان ستایشی بكەن، ئەوجا قسە بەناوبانگەكەی فەرموو: سوێند بەو خودایەی كە بێجگە لە خۆی خودای تر نییە، ئەگەر سەگ لاقی هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ بگرن من لەشكرێك ناگێڕمە دواوە كە پێغەمبەر ﷺ ناردبێتی، وە بە هیچ جۆرێك بڕیاری پێغەمبەر ﷺ هەڵناوەشێنمەوە[٦١].

پەروەردگار ویستی وایە كە راسپاردەی ئەبوبەكر هاندانی خەڵكی بێ بۆ جیهاد، هەر وەكو لە دوا كاتژمێرەكانی ژیانیدا عومەری بانگ كردو پێی فەرموو: "گوێت لێ بێ ئەی عومەر" ئێستا پێت رادەگەیەنم و دوایش كاری پێ بكە لەوانەیە ئەمڕۆ دوارۆژی ژیانم بێت - رۆژی دووشەممە بوو - ئەگەر من مردم ئێوارە نەكەیتەوە هەتا مسوڵمانان نەگەیەنیتە (مثنى)[٦٢].

ئەگەر شەویش مردم بەیانی نەكەیتەوە هەتا مسوڵمانان نەگەیەنێتە (مثنى)، وە مردنی من با خەریكتان نەكات، ئەگەر فەرمانی ئایینەكەتان و بڕیاری پەروەردگارتان بە لاوە گەورەو پیرۆزە، خۆ دیتمت لە كاتی كۆچی دوایی پێغەمبەردا ﷺ چیم كرد، خۆ هیچ كەس بەو شێوەیەی نەكرد، وە سوێند بە خوا ئەگەر فەرمانی خودام دواخستبا خوا زەلیلی دەكردین و تۆڵەی لێ دەستاندین و شاری مەدینە ئاگری تێبەردەبوو، ئەبوبەكر كە باشترین كەسە لە دوای پێغەمبەر ﷺ هەستی بەوە كردبوو كە دواكەوتن لە بەجێهێنانی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەی بۆ جیهادو راپەڕین ئەنجامەكەی زەلیلی و خەسارەتمەندییە[٦٣].

---

[٦١] حياة الصحابة، ب١، ل٤٤٠.

[٦٢] حياة الصحابة، ب١، ل٤٤١.

[٦٣] قال د. عبدالله عزام (رحمه الله): (إنَّ أقوالنا وأفعالنا ستظل جثثاً هامدةً ما لم نسقها بدمائنا) (وەرگێڕ).

ئەوە قورئان لە نێوماندا دادگەری دەکات، ئەوەش سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ شایەتە لە سەرمان، ئەوەش ڕێنموونی هاوەڵان، لە تێگەیشتنیاندا لەبارەی گرنگی جیهادەوە لەم ئایینەدا، ئایا ئەم هەموو دەقە ئاشکراو روون و درەوشاوانە هیچ کۆسپ و گرانییەکیان تیادایە بۆ تێگەیشتن لێیان؟ ئەوەتا دزی "ئابڕوو" خۆی گەیاندە داوێنی ئافرەتە باوەڕدارەکان!! ئایا وازی لێ بهێنین، خووڕەوشت و ئابڕوو نەمێنێت.

رُبَّ وامعتصماه انطلقت ملء أفواه الصبايا اليتم

لامست أسماعهم لكنّها لم تلامس نخوة المعتصم

لەوایە گەلێ جار هاواری (وامعتصماه) بڕ بە دەمی منداڵانی هەتیوو بەرز بووبێتەوە، وەمسوڵمانان گوێیان لەم هاوارانەش بووبێ، بەڵام ئەو غیرەتەی کە لە (معتصم)دا جۆشا لەماندا نەجۆشا.

رووسی دوژمن دوو سەدو پێنج هەزار منداڵی مسوڵمانانی ئەفغانی بردووە بۆ ئەوەی لەسەر بیروباوەڕی کۆمۆنیزم پەروەردەیان بکات و تۆوی بێ باوەڕی لە ناخیاندا بڕوێنێت، هەروەها ئەمریکا بڕیاری کردنەوەی "٦٠٠" قوتابخانەی داو بەڵێنی دا بە سەدو پێنج هەزار لە منداڵی ئەفغانی لە ناوخۆو دەرەوەدا بۆ پەروەردەو فێرکردنیان...[٦٤]

[٦٤] ئەی دەبێ ئەمڕۆ هەڵوێستمان چۆن بێ کەوا هەزاران ڕێکخراوو پەیمانگاو سەدان هەزار مژدەدەر (المستبشرین) هەن بۆ بڵاوکردنەوەی گاورییەتی؟؟!!! جگە لەوەی ٩٨٪ی راگەیاندنەکان (سەتەلایت و تەلەفزیۆن و گۆڤارو بڵاوکراوەکان و .....) بە دەستی جوولەکەیە بۆ تێکدانی رەوشتی خەڵکی. (وەرگێڕ).

دەکوان بانگەوازکەرانی ئیسلام؟ کوان پەروەردەکەرە مسوڵمانەکان؟ چیان ئامادەکردووە بۆ رزگارکردنی بەرەی ئیسلامی لە پێناوی بەڕێوەبردنی ئەم جیهادە گەورەو پیرۆزە[٦٥]؟

زانایانی (فقه) دەفەرموون: وڵاتی مسوڵمانان وەك یەك وڵات وایە، هەر پارچەیەك لە وڵاتی مسوڵمانان ترس رووی تێ کرد، دەبێ هەموو موسڵمانان - کە وەك یەك لاشە وان - هەست بەو مەترسییە بکەن و هەوڵی دوورخستنەوەی ئەو مەترسیە بدەن.

چ دەبێ بۆ زانایان ئەگەر لاوەکانمان هەڵبنێن بۆ جیهاد؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەڵنان فەرزە ﴿ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ النساء: ٨٤.

چی دەبێ ئەگەر بانگەوازکەرانی ئیسلامی ساڵێکی ژیانیان تەرخان بکەن و لە نێو موجاهیدانی ئەفغاندا بژین بۆ رێنموونی کردنیان؟ چ دەبێ ئەگەر قوتابیانی زانکۆ ساڵێکی خوێندنیان دوابخەن بۆ ئەوەی فەرزی جیهاد جێبەجێ بکەن و بەشدار ببن لە بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی و زیندووکردنەوەی ئایینی خودا لەسەر زەوی؟ ﴿ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ التوبة: ٨٧ – ٨٨.

واتە: رازی بوون بەوەی کە لەگەڵ دواکەوتووەکاندا بن و دڵیان مۆرکراو تێگەیشتنیان نییە، بەڵام پێغەمبەرو ئەوانەی کە لەگەڵیدان لە باوەڕدارەکان

---

[٦٥] قال النبي ﷺ : "مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى" متفق عليه، (وەرگێڕ).

جیهادیان کرد بە ماڵو بە گیان، ئەوان چاکەو پاداشتیان بۆ هەیەو هەر ئەوانن سەرفرازو سەرکەوتوون.

ﭺ دەبێ ئەگەر پێشەوایانی خەڵکی مسوڵمان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئامۆژگاری خەڵکی بکەن بۆ دەرچوون لە پێناوی ڕێگای خوادا بۆ پاراستنی ئایینی خودا بە خوێنو بە گیان؟

هەتا کەنگێ گەنجە باوەڕدارەکان خۆیان دەکوتن بە زەویداو دوادەکەون لە جیهاددا؟[٦٦]

ئەو گەنجانەی کە دڵیان بڵێسەی سەندووە و غیرەتیان بزواوە بۆ ئەوەی بە خوێنی ئاڵو گەشیان خاکی ئیسلام ئاو بدەن... ئەوەی کە ڕێگەی جیهاد لە گەنجێك دەگرێت جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی کە ڕێگە لە نوێژو ڕۆژوو بگرێت. ئایا ئەوەی ڕێگە لە جیهاد دەگرێت ناترسێ بەر واتای ئەو ئایەتە بکەوێت - با بە ناڕاستەوخۆش بێ - ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾ الأحزاب: ١٨ ـ ١٩.

ﭺ دەبێ ئەگەر باوکان یەکێ لە ڕۆڵەکانیان پێشکەشی ڕێگەی خودا بکەن کە لەم دنیا بۆی دەبێتە سەربەرزیو لە ڕۆژی دواییدا بۆی دەبێتە تکاکاری؟[٦٧]

---

[٦٦] أي يومي من الموت فر يوم لا قدر أم يوم القدر
يوم لا قدر لا أرهبه ومن المقدر لا ينجو الحذر (علي بن أبي طالب). (وەرگێڕ).

[٦٧] (ويشفع في سبعين إنسان من أهل بيته) (صحيح الجامع) (وەرگێڕ).

چ دەبیٚ ئەگەر باوکان پاڵ بە یەکیٚ لە کوڕەکانیانەوە بنیٚن بەرەو مەیدانی پیاوان و بۆتەی پاڵەوانان؟ خۆ هەندیٚ کەس وەجاخ کویٚرن، دەبا ئەوەی کوڕی زۆرە سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەو نیعمەتەی پیٚی بەخشیوەو زەکاتیان لیٚ بدات...

ئایا تۆ دروستکەری گیان و بەخشندەی رزق و رۆزیت؟ یان پەروەردگاری جیهان؟ تۆ ئەی بۆچی چرووکی بە ماڵ خوداوە بکەیت "لن تموت نفس حتى تستكمل اجلها ورزقها".

چی دەبیٚ ئەگەر دەفتەری کردەوەی مسوڵمانان چەند دیٚریٚکی رازابیٚتەوە لەبارەی جیهادەوە؟ پیٚشەوای بیٚ ویٚنەمان ﷺ لەم فەرموودەیەدا بۆمان دەسەلمیٚنیٚت کە "رباط يوم في سبيل الله خير من صيام شهر و قيامه" ئیٚشککرتنی رۆژیٚك لە پیٚناوی خودادا باشترە لە رۆژوو و شەونویٚژی مانگیٚك، وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمویٚ: "رباط يوم في سبيل الله خير من الف يوم فيما سواه من المنازل، يقام ليلها ويصام نهارها". ئیٚشککرتنی رۆژیٚك لە پیٚناوی خودادا باشترە لە هەزار رۆژی دی کە تیایدا بە رۆژوو بیت و شەوەکەشی شەونویٚژ بکەیت.. هەروەها دەفەرمویٚت: "قيام ساعة في الصف للقتال في سبيل الله خير من قيام ستين سنة"[٦٨].

واتە: وەستانی کاتژمیٚریٚك لە ریزی جەنگدا باشترە لە شەوبیٚداری و شەوونویٚژی ٦٠ ساڵ.

ئەی برایانی موسڵمان: هەڵمەت بەرن بۆ پاریٚزگاری کردنی ئاینەکەتان و بەرزکردنەوەی سوننەتی پیٚغەمبەرەکەتان ﷺ.

---

[٦٨] حديث صحيح ـ رواه أحمد والترمذي صحيح الجامع رقم الحديث ٥٤٠٣.

ئەی برای خۆشەویست: دەی هەڵسە خۆت کۆبکەرەوەو زەلیلی و سەرشۆڕی لەسەر نەتەوەکەت لاببە[٦٩].

ئەی برای خۆشەویست ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾.

چیرۆکی (بوخاری) خوێناوی‌و (فەلەستین)ی بریندارو (عەدەن)ی سوتاوو (ئەوجادین)ی ئەسیر کراو، وە رووداوە دڵتەزێنەکانی "ئەندەلوس" باشترین پەندن بۆمان[٧٠].

ئایا پەندو ئامۆژگاری لەو رووداوانەی رابردوو وەرنەگرین و بڵێین کار لە کار ترازا؟

ئێمە هیوادارین کە خوای گەورە رووسەکان لە خاکی ئەفغاندا پاشەکشێ پێ بکات‌و دەریان پەڕێنێ.

دیسان تاقە پێشەوامان ﷺ دەفەرموێ: "من لم يغزو ويجهز غازيا او يخلف غازيا في اهله بخير اصابه الله بقارعة قبل يوم القيامة"[٧١].

هەرکەسێ غەزاو جیهاد نەکات و خۆیشی ئامادە نەکردبێت لە نێو ماڵ‌و منداڵیدا، خودای گەورە تووشی ئەو رووداوو کارەساتەی دەکات کە لە رۆژی دواییدا روودەدات.

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾ ق: ٣٧

الا هل بلغت؟ اللهم فاشهد، الا هل بلغت؟ اللهم فاشهد، الا هل بلغت؟ اللهم فاشهد.

---

[٦٩] لترمي المنايا حيث شاءة فإني في الشجاعة قد ربيت (وەرگێڕ).

[٧٠] کورد دەڵێ: "شەڕ بە کۆنە قین دەکرێ". (وەرگێڕ).

[٧١] رواه ابوداود عن أبي أمامة مرفوعاً.

# کۆتایی

١- ئەگەر دوژمن هاتە نێو خاکی موسڵمانانەوە جیهاد دەبێتە (فرض العين) بە لای هەموو زانایانی حەدیس و فیقهو لێکۆڵەرەوانی قورئانەوە.

٢- کاتێك کە جیهاد بوو بە فەرزی عەین هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ نوێـژو ڕۆژوودا بـە لای سـێ ڕێبازیانـەوە، بـەڵام حەنبەلییـەکان نوێـژ پـێش جیهـاد دەخەن.

لە کتێبی (بُلغة السالك)ی ڕێبازی مالیکدا هـاتووە: "جیهـاد لـە پێنـاوی خـوادا بـۆ بەرزکردنـەوەی وشـەی (الله) هـەموو سـاڵێك فـەرزی کیفایەیـە، واتـە ئەگـەر هەنـدێ لـە مـسوڵمانان پێـی هەڵـسان فـەرزە کـە لـە سەرشـانی ئـەوانی دی لادەچێت، بەڵام کاتێك پێشەوای مسوڵمانان فەرمانی دەرکردو دوژمن هێرشی کردە سەر خاکی مسوڵمانان ئەوکاتە جیهاد دەبێتە فەرزی عەین).

وە لە کتێبی "مجمع الانهر"ی ڕێبـازی حەنەفیـدا هـاتووە: "ئەگـەر جیهـاد بـە کۆمـەڵێ لـە مـسوڵمانان ئـەنجام نـەدرا، بـە هـەمو مـسوڵمانان نـەبێت ئەوکاتـە دەبێتە فەرزی عەین، وەکو نوێژ...".

هـەروەها لـە کتـێبی "حاشـية ابـن عابـدين"ی ڕێبـازی حەنـەفی (ب٣ ل ٢٣٨)دا هـاتووە "جیهـاد دەبێتـە فـەرزی عـەین . ئەگـەر دوژمـن هێرشـی کـردە سـەر گۆشـەیەکی وڵاتـی ئیـسلام . وەك نوێـژو ڕۆژوو، وە بـە هـیچ شێوەیەك نـاتوانن وازی لێ بهێنن".

٣- ئەگەر جیهاد بووە فەرزی عەین ئیدی پرسکردن و ڕێگـەدانی دایك و بـابی ناوێ هەروەك چۆن نوێژی بەیانی و ڕۆژووی ڕەمەزان نایەوێت.

٤- جیاوازی نییـە لـە نێـوان ئـەو کەسـەی بـەبێ بیـانوو واز لـە جیهـاد دێنـێ و ئەوەی کە بەبێ بیانوو ڕۆژووی ڕەمەزان دەشکێنێت، ئەگەر لە کاتێکدا جیهـاد بووبێتە فەرزی عەین.

٥- ئەوانەی کە جیهادیان لەسەر فەرزە، بە بەخشینی پارەو پول ئەو فەرزەیان لەسەر لاناچێت ئیدی ئەو پارەیە هەرچەند بێ، هەروەك چۆن ناگونجێ ئەگەر بابایەك هەندێ پارە بدات بە هەژارێك بۆ ئەوەی لە جیاتی ئەو نوێژ بكات و بە ڕۆژوو بێت.

٦ - جیهاد فەرزێكی هەمیشەییە لە تەمەندا وەك نوێژو ڕۆژوو كە چۆن ناگونجێ ساڵێك بە ڕۆژوو بین و ساڵێكیش بە ڕۆژوو نەبین، یان ڕۆژێ نوێژ بكەین‌و ڕۆژێكی دی نەیكەین، جیهادیش هەروەها، ناگونجێ ساڵێك جیهاد بكەین‌و ساڵێك وازی لێ بهێنین.

٧- ئێستا جیهاد فەرزی عەینە بە گیان‌و بە ماڵ لەهەر جێیەك كە كافران دەستیان بە سەریدا گرتبێت، هەروەها بە بەردەوامیش فەرزی عەین دەبێت تا ئەو ڕۆژەی كە هەموو پارچەیەكی خاكی مسوڵمانان ڕزگار دەكرێت ئەگەرچی ئەو پارچە خاكە تەنها ڕۆژێ لە ڕۆژان هی مسوڵمانان بووبێت.

٨- كە ناوی جیهاد دەهێنرێت واتە خەباتی چەكدارانە، هەروەك (ابن رشد) دەفەرموێ هەرچوار ڕێبازەكەش بڕیاریان لەسەر داوە[٧٢].

٩- هەركات گوترا: "في سبيل الله"[٧٣]. واتە جیهاد هەروەك ئیبن حەجەر فەرموویەتی.

١٠- ئەو قسەیەی كە دووبارەی دەكەنەوە "رجعنا من الجهاد الأصغر. القتال. الى الجهاد الأكبر. جهاد النفس.". لە جیهادی بچوكەوە. چەكداری. گەڕاینەوە بۆ جیهادی گەورە . پەروەردەكردنی دەروون . كە گوایە حەدیسە . ئەوە قسەیەكی بەتاڵ‌و حەدیسێكی دروستكراو "موضوع"ەو هیچ بناغەیەكی نییە،

---

[٧٢] تەنها لەم ئایەتەدا نەبێ (وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَاداً كَبِيراً) (الفرقان: ٥٢) (وەرگێڕ).

[٧٣] الفتح، ب٦، ل٢٣.

ئەوە قسەی "ابراهیم بن ابی عبلە"یە کە یەکێکە لە (تابعین)و ئەم قسەیەش پێچەوانەی دەقی ئایەتو حەدیسە.

١١- جیهاد لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلامە، بەڵام پێش جیهاد هەندێ قۆناغی دی هەن[٧٤]:

١- کۆچ کردن.

٢- مەشق کردنو ئامادەبوون.

٣- ئێشککرتنو سەنگەر گرتن.

٤- جەنگو کوشتار.

کۆچ کردن پێویستی جیهادە، رزگارکەری مرۆڤایەتی ﷺ دەفەرموێ: "إن الهجرة لا تنقطع مادام الجهاد"[٧٥]. واتە: کۆچکردن لە جیهاد ناپچڕێت. بەڵام (الرباط) ئێشککرتن، بریتییە لە مانەوە و ئارامگرتن لە سنووری دوژمندا بۆ پاراستنی مسوڵمانان.

ئێشککرتن پێویستییەکە لە پێویستییەکانی شەڕ، چونکە هەموو رۆژێ هەر شەڕ نییە، مرۆڤ ماوەیەکی دوورودرێژ ئێشك دەگرێت، بەڵام لەوانەیە لەو ماوەیەدا لە شەڕێك یان لە دواندا بەشداری بکات.

١٢- ئەوڕۆ جیهاد کردن فەرزی عەینە بە گیانو بە ماڵ لەسەر هەموو مسوڵمانێك، نەتەوەی ئیسلامی هەموویان بە تاوانبار دەژمێردرێن هەتا دوا پارچەی خاکی پیرۆزی مسوڵمانان لە ژێر چنگی کافران رزگار دەکرێت، تەنها مسوڵمانە موجاهیدەکان نەبن.

---

[٧٤] قال رسول الله ﷺ: "وأنا آمركم بخمسٍ الله أمرني بهن: الجماعة والسمع والطاعة والهجرة والجهاد في سبيل الله" هذا حديث حسن، (وەرگێڕ).

[٧٥] صحيح الجامع، رقم الحديث ١٩٨٧.

١٣- جیهاد لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ چەند جۆر بووە: بۆ نموونە: جەنگی بەدر بە حەزی خۆیان بووەوە سوننەت بووە، شەڕی تەبووك و خەندەق فەرزی عەین بووە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، چونكە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی تەبووكدا داوای لە هەموو مسوڵمانان كرد كە بەشدار بن، وە شەڕی خەندەقیش، چونكە كافران شاری مەدینەیان داگیركردبوو كە خاكی مسوڵمانانە، بەڵام شەڕی خەیبەر كە لە ساڵی حەوتی هیجریدا بوو فەرزی كیفایە بوو، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی هەموو كەسیشی نەدا بەشداری تێدا بكات، ئەوانە نەبن كە لە ساڵی شەشی هیجریدا لە پەیمانی حودەیبیەدا بەشداربوون.

١٤- جیهاد لە سەردەمی هاوەڵاندا (خودایان لیٚ ڕازی بێت) و لەسەردەمی شوێنكەوتوواندا زۆربەی جار فەرزی كیفایە بووە، چونكە شەڕەكانی ئەو سەردەمە بریتی بوون لە ڕزگاركردنی خەڵكی لە ژێر چنگی زۆردارانداو فراوانكردنی دەوڵەتی ئیسلامیی.

١٥- بەڵام ئەوڕۆ جیهاد بە خۆبەخت كردن و قوربانی فەرزی عەینە، چونكە خاكی مسوڵمانان لە ژێر ركێفی كافراندایە.

١٦- پەروەردگاری مەزن عوزرو بیانوو لە كەس وەرناگرێت بۆ وازهێنان لە جیهاد، بێجگە نەخۆش و كوێرو ئەو منداڵەی كە هێشتا پێنەگەیشتووە، وە ئەو ئافرەتەی كە ڕێگەی كۆچ كردن و جیهاد نازانێت، وە پیرو پەككەوتەی بە ساڵاچوو، وە نەخۆشێك كە دەردەكەی زۆر گران بێت، وەشەل و كوێر، خۆ ئەگەر توانایان هەبوو خۆیان بكەیەننە سەربازگەكانی مەشق پیٚ كردن زۆر لە جێی خۆیەتی، بۆ ئەوەی موجاهیدەكان ڕێك بخەن و بەڕێیان بكەن، وە فێری خوێندنی قورئانیان بكەن، وە ورەیان بەرز بكەنەوە و هانیان بدەن، هەروەك عبدالله كوڕی ئوم مەكتوم لە دوو شەڕی ئوحود و قادسیەدا كردی.

ئیدی بێجگە لەوانەی کە باسمان کردن کەسی دی عوزری لێ وەرناگیرێت، ئەوجا ئەو کەسە مووچەخۆر بێت، یان خاوەن پیشە بێت، یان سەرپەرشتیکاری کرێکاران بێت، یان بازرگانێکی گەورە بێت، کەسیان بیانوویان لێ وەرناگیرێت ئەگەرچی پارەو ماڵەکەشیان بدەن[٧٦].

١٧- جیهاد پەرستشێکی بە کۆمەڵە، خۆ هەموو کۆمەڵێکیش دەبێ فەرماندەیەکیان هەبێت، گوێڕایەڵی کردنی فەرماندەش لە جیهاددا زۆر پێویستە، وە هەر دەبێ دەروون رابهێنرێت لەسەر گوێڕایەڵی فەرماندە، فەرماندەو پێشەوای بەڕێزمان حەزرەتی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: (علیك السمع والطاعة في عسرك ویسرك ومنشطك ومكرهك وأثرة علیك)[٧٧]. واتە: بیستن و گوێڕایەڵیت لەسەرە، لە خۆشی و لە ناخۆشیدا، لە سستی و چالاکێتیدا، لە کاتێکدا کە یەکێك پێش تۆ دەخرێت.

## چەند تێبینییەك بۆ ئەوانەی کە بەرەو کاروانی جیهاد دەکەونە رێ:

**یەکەم:** جیهادی گەلان بە گشتی وەکو جیهادی بانگەوازکارانی ئیسلامی نییە، ئەندامەکانی بانگەوازکاران هەمیشە کەمن، بەڵام ئەو ئەندامانە پاڵفتەکراوو هەڵبژێرراون، ئەمما ئەو ئەندامانە لە توانایاندا نییە بە تەنها هەر خۆیان بەرەو جیهادێکی دوورو درێژ رێگە بەرن، وە ناتوانن بەرەنگاری دەوڵەتان ببن، بەڵکو دەبێ هەموو گەل بەشداری و هاوکارییان لەگەڵدا بکەن،

---

٧٦ (قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ) (التوبة : ٢٤ ) (وەرگێڕ).

٧٧ رواه مسلم عن أبي هريرة.

گەلان کەموکوڕیو نەنگییان تیادا هەیە، هیچ کەس گومان نابات کە گەلێك هەموو رۆڵەکانی پاكو بێ خەوش بن وەك فریشتە.

دووەم: گەلی ئەفغانیش وەکو گەلانی دی ناتەواوی نەنگی تیادایە، وەك لە پێشەوە گوتمان کەس گەلێکی وا پێ نازانێ کە کەموکوڕی تیادا نەبێت، بەڵام جیاوازی نێوان گەلی ئەفغانو گەلانی دی ئەوەیە کە گەلی ئەفغان سەربەرزی خۆیان کڕییەوە بە دەریایەك خوێنو هێندەی کێوێك لاشەو تەرم، بەڵام گەلانی دی هەر لە یەکەم رۆژی دەستدرێژی کردنەوە بۆ سەریان، یەکسەر خۆیان خزاندە ژێر ڕکێفی کوفرو ئیمپریالیزمەوە..

سێیەم: گەلی ئەفغانی نەخوێندەوار لەسەر رێبازی پێشەوا حەنەفی (رەحمەتی خوای لێ بێت) پەروەردە کراون، جگە رێبازی حەنەفیش هیچ رێبازێکی دی لە ئەفغانـدا نییە، لەبەرئەوەی گەلی ئەفغان وا گومان دەبەن کە ئەوەی سەرپێچی رێبازی حەنەفی بکات لە موسڵمانان نییە، وە نەبوونی رێبازەکانی دی لە ئەفغاندا بووە هۆی دەمارگیری بە رێبازی حەنەفییەوە لە ئەفغاندا، جا ئەوەی کەرەکێتی لەگەڵ گەلی ئەفغانیدا جیهاد بکات دەبێ هەستیان بریندار نەکاتو رێز لە رێبازی حەنەفی بگرێت.

چوارەم: گەلی ئەفغانی گەلێکی وەفادارن، خاوەنی پیاوەتیو مرۆڤایەتین، فڕوفێڵو تەڵەکەبازی نازانن، ئەگەر یەکێکیان خۆشویست خۆیان بەخت دەکەنو خوێنیان دەڕێژن لە پێناویدا، وە کاتێك تووڕە بکرێن کاردانەوەی خراپیان نییە. وە وازهێنان لە هەندێ شت لە نوێژدا لە سەرەتای تێکەڵ بوون لەگەڵیاندا بوارێکی چاکت دەداتێ بۆ ئەوەی بچیتە نێو دڵیانەوەو بتوانی پەروەردەیان بکەیتو ئامۆژگاریان ئاراستە بکەیت، وە هەوڵی چاککردنیان بدەیت لە ئیشو کاری ژیانیاندا و ئاینەکەیاندا وە لەم بارەیەوە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و مالیكو ئیبن تەیمیە) "رەحمەتی خودایان لێ بێ" فەتوایان داوە.

**پێنجەم:** پێویستە بزانین کە ڕێگای جیهاد سەختو دژوارە، دوورو درێژە، بەگوڵ نەچێنراوە بە دڕكو داڵ تەنراوە، ڕێگایەکی ئەستەمەو بە ئاسانی نابڕێت، بۆ ئەوانەی کە لە سەرەتاوە ورەیان بەرزەو بە حەماسەتەوە ڕوو دەکەنە جیهاد.

ئەشکەنجەو ئازاری جیهاد و لافاوی سۆز دەبێ لە دەروونێکی وەهادا بێ کە خۆڕاگربێت بەرامبەر بە توندوتیژی و پەروەردە کرابێت لەسەر کۆسپو تەگەرە و ناخۆشی.

زۆر لە لاوان هاتن بۆ جیهاد بەوپەڕی ورەبەرزیو حەماسەتەوە، بەڵام پاشان وردە وردە ورەیان بەرداو واشیان لێهات مشتومڕ لەسەر حوکمەکانی جیهادیش دەکەن.

**شەشەم:** خوای گەورە ئۆباڵی یاریدەدانی موجاهیدان دەگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوەی لە پێناویدا دەربچێ بۆ جیهاد، پەروەردگاری بەبەزەیی دەستی دەگرێت و دڵی دەبەستێ بە خۆیەوە و ورەی بەهێز دەکاتو خۆڕاگری دەکات...

پێشەوای موجاهیدان ﷺ دەفەرموێ: "ثلاث حق على الله عونهم، المجاهد في سبيل الله، والكاتب الذي يريد الأداء، والناكح الذي يريد العفاف"[٧٨].

واتە: خوای گەورە یارمەتیدانی سێ کەس بە مافی خۆی دەزانێت:

١. یەکێ لە ڕێگای خوادا تێ بکۆشێو جیهاد بکات.

٢. قەرزدارێك کە بیەوێت قەرزەکەی بداتەوە.

٣. کەسێك کە بیەوێت ژن بهێنێت بۆ ئەوەی کە بە پاکی بمێنێتەوە تووشی تاوان نەبێت.

وسبحانك اللهم وبحمدك اشهد أن لا إله إلا أنت، استغفرك وأتوب اليك.

---

[٧٨] رواه أحمد والترمذي والنسائي وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

# کورتەیەک لە ژیاننامەی

# شەهید

# دکتۆر عبداللّە عەززام

موصعەبێك بووی لە بوێژەو لە گوفتار
خەبابێك بووی لە ئاقار ئێش‌و ئازار
خالیدێك بووی تێکدەری قەڵای زۆردار
خاوەن بەڵێن بووی لەگەڵ پەروەردگار
مامۆستای شەرمن لە ئاست بڕوادار
مامۆستای مل پەڕێنی کافرو زۆردار

. کۆساری[٧٩] .

[٧٩] کاك شەریف وەرزێر دەڵێت: کۆساری ئەم شیعرەی بەسەر شەهید ئەحمەد شاسوار دا وتووە، کە لە ١٩٨٨/٧/٢٢ لە گردی ڕمکان لە قەلاتوکان شەهید بووە، بەلام ئێمە ئەم شیعرەمان بە شیاوزانی لێرەدا. (وەرگێڕ)

*** سەرەتا:**

ژیانی نەتەوەش تەنها بە مەرەکەبەی زانایان و خوێنی شەهیدانەوە بەستراوە، جا چەند جوانە مێژووی نەتەوە بە مەرەکەب و خوێنی زانا تۆمار بکەین و نەخشەی مێژووی ئیسلام بە دوو ڕەنگ بنەخشێنین ڕەنگێکی ڕەش کە ئەوەیە زانایان بە مەرەکەبەیی قەڵەمەکەی نەخشاندوویەتی، ڕەنگێکی سوور کە شەهید بە خوێنی ڕازاندوویەتییەوە، لەوەش جوانتر ئەوەیە کە خوێن و مەرەکەب یەك بن و هەر ئەو دەستی زانایەی مەرەکەب سەرف دەکات و قەڵەم دەجوڵێنێ، هەمان دەست بێت کە خوێنی لێ بچۆڕێ و گەلان بجوڵێنێ و هەتاکو زانایانی شەهید زیاتر بێت، زیاتر پشتەکان (جیل)ەکان لە سست و خاوی قوتار دەبن و لە خەوی قورسیان ڕادەبن، چونکە مێژوو دێرەکانی خۆی بە خوێن نەبێت نانووسێت و سەروەری لەسەر کەللە سەرانەوە نەبێ سەروەری وەدەرنانێت، عیزەت و سەربەرزی لەسەر ئێسك و پروسك و لاشە نەبێ دانامەزرێت و مەملەکەت و شکۆمەندی و شەرەف و دەوڵەت و کۆمەڵگاکان بە نموونە و سەرمەشق نەبێ ناکرێ بنیات بنرێ.

شەبەقی ئەو وشە سورانە لە خەرمانەی دەوری مانگی چواردەی گیانی پاکی شەهیدە مەزنەکەی ئیسلام (دکتۆر عبدالله عەزام)ەوە دێت و هەموو پیت و خاڵەکانیان لە خەنەبەندانی خوێندا ڕەنگین بوون و خاوەنەکانیان کردۆتە سەرمەشقی بەرچاوی زانایانی ڕاستگۆ ئیشکەرو موجاهیدی تێکۆشەر.

## * لە دایك بوونی:

شەهیدی سەروەر لە ساڵی ١٩٤١ لە گوندی (سیلة الحارث)ی لیوای جنین لە باکووری ناوەڕاستی فەلەستین لە دایکبووە، باوکی ناوی (یوسفی مصطفی عزام)ەو کە ساڵێك دوای شەهیدبوونی رۆڵەکەی کۆچی دوایی کردووە، دایکی ناوی (زکیە صالح حسین ئەحمەد)ە، نزیکەی ساڵێك پێش شەهیدبوونی کوڕەکەی مردووە.

هەر لە سەرەتای منداڵیەوە زیرەکی و وریایی و لێهاتوویی پێوە دیار بوو، یەکێك لە خوشکەکانی دەڵێت: کاتێك عبدالله لە قۆناغی سەرەتایی بوو کە دەچوومە لای دەم بینی لە ناو کتێبەکانیدایەو سەرقاڵی خوێندنەوەیە، منیش پێم ئەوت: برام رەحم بە خۆت بکە تۆزێ بڕۆ نێو برادەرەکانت کە خەریکی گەمەو یارین، ئەویش ئەوەندەی ئەوت کە ئێستا وەختی نییە، ئەو زیرەکی و وریاییەی بوو بە چاوساغی و نەیهێشت کات و رەنجی لە شتی بێ سووددا بە فیڕۆ بڕوات، لەبەرئەوە هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدا بوو کە چووە ریزی (ئیخوان موسلمین) و هەر لە پۆلی ٦ی سەرەتایی بوو کە زۆرجار (ابو ماجد)[٨٠]ی چاودێری گشتی ئیخوانی ئەردەن لە دێیەکەی خۆیان سەردانی ئەکرد، هەر لە منداڵییەوە نیشانەی تەقواو دڵ و دەروون پاکی و پیاوچاکی پێوە دیار بوو، حاجی زەکیەی دایکی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (شەو کە هەڵدەستام دەچوومە لای سەیرم دەکرد نوێژ دەکات منیش پێم ئەوت: رۆڵە بەزەیت بەخۆتا بێتەوە بڕۆ ناو جێگاکەت و ئیسراحەت بکە)، ئەویش ئەیوت: (چاکوا بەوە نەبێ دڵ و گیانمان دەحەسێتەوە).

---

[٨٠] ناوی محمد عبدالرحمن خەلیفەیە.

شەهیدی گەورە خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە گوندەکەی خۆیان تەواو کردو ئینجا چووە کۆلێژی کشتوکاڵی (خضورية) لە (طولكرم) و بە پلەی نایاب تەواوی کرد، دوای ئەوە بووە مامۆستا لە گوندی (ادر) لە خوارووی ئەردەن، لە دوای ساڵێك بۆ قوتابخانەی (برقين) لە قەزای (جنين) گوازاراوەتەوە.

یەکێك لەو مامۆستایانەی لەوێ لەگەڵیدا بوو دەڵێ: بەراستی شێخ عبدالله لە هەموو مامۆستاکانی تر جیایە، زۆر قورئان دەخوێنێ و قسەی خۆش لەگەڵ قوتابییەکان دەکات و مامۆستاکان لە کاتی پشوودا خەریکی بابۆڵەی چەورەی (ساندویچ) خواردن و چا خواردن دەبوون، بەڵام ئەو بە تەنها دەچووە ژوورێك و قورئان دەخوێنێ و ساتێکی خۆی بە فیڕۆ نەئەدا.

شەهید زۆر عاشق و تامەزرۆی خوێندن و فێربوون بوو، لەبەرئەوە بە ئەوەندە خوێندنەوە دڵی ئاوی نەخواردەوە تا پەیوەندی بە کۆلێژی (شەریعە)ی دیمەشقەوە کرد و لە ساڵی ١٩٦٦ بە پلەی زۆرباشە تەواوی کرد، لەکاتی خوێندندا ئاشنایەتی لەگەڵ زانا گەورەکانی شام وەکو دکتۆر موحەممەد ئەدیب صاڵح، شێخ سەعید حەوا، دکتور محمد سعيد رمضان البوطي و مەلا رمضانی باوکیدا پەیدا کرد، هەروەها چاویشی بە (مەروان حەدید) کەوت کە بە خۆشویستنی جیهادو بەگژداچوونی تاغوت و ستەمکاران بەناوبانگ بوو.

کاتێك لە ساڵی ١٩٦٧ دا کەناری رۆژئاوا لە لایەن جوولەکەوە داگیر کرا، شەهید لە قوتابخانەی دواناوەندی (تاج)ی کچان مامۆستا بوو، ئیدی نەیتوانی دانیشێ و لەگەڵ چەند لاوێکی تری مسوڵماندا چووە باکووری ئەردەن و دەستیان کرد بە جیهاد کردن لە دژی ئیسرائیل، ئەوکاتە شێخ عبدالله عزام ئەمیری بنکەی (بيت المقدس) بوو لە (مرو) وماڵیشی لە شوقە خۆشەکانی عەمانەوە بۆ تاقە ژوورێکی قوڕی ئەو کێوانە گواستەوە.

لەوکاتەدا چەند بنکەیەکی چەپڕەوی مارکسی لەو دەوروبەرەدا هەبوون کە وەکو هەموو شوێنێکی تر گورگی نێو پێستە مەڕی دروشمە بریقەدارەکانیان بوون و بە پێی ڕێبازە هەمیشەییەکەیان کە میکاڤیللی تەواو عەیارەو هەر ڕێ‌و کوێرە ڕێگەیەك بە ئامانجیان بگەیەنێ دەیگرنەبەر، لەوێش ئەو لادێ‌و جوتیارە چەوساوانە ببوونە پارو بە توندی شتیان لێ دەسەندن‌و ئەگەر نەشیان دایە ئەوا هەڕەشەی تێبەردانی تۆپ‌و دەبابەی ئیسرائیلیان لێ دەکردن‌و بە ئەنجامدانی دوورە تەقەیەك، ئەوکاتە عبدالله عزام و ئەو موجاهیدانەی لەگەڵیدا بوون ببونە خێرو بەرەکەت بۆ ڕەزو باخی ئەو لادێیانە، وەك چاوی خۆیان بۆیان دەپاراستن‌و بە کردەوە بۆیان سەلماندن مشوورخۆری ڕاستەقینەی ئەوانن، نەك هەروەکو ئەوانی تر نایانکەنە بەردەبازی خۆیان، بەڵکو لە پێناوی ئەواندا هەموو جۆرە ڕەنج‌و زەحمەتێك لە خۆدەگرن‌و بە عیبادەت‌و خواپەرستیشی دەزانن، ئیتر لەمەوە بوونە جێگای متمانەی خەڵکی ئەو ناوەو بە سەروماڵ پشتگیریان دەکرد، لەو بارە سەخت‌و ناهەموارەشدا شەهیدی مەزن بەوپەڕی دڵگەرمییەوە لە ئەشکەوت‌و سەنگەرەکاندا خەریکی خوێندنەوە بوو، چونکە پەیوەندی بە زانکۆی ئەزهەرەوە کردبوو دەیویست بە (مراسلة) ماجستێر وەربگرێت، لەو بارودۆخەدا ئیمتیحانی داو لە دواییدا جوابی بۆ برایەکی میسری نارد لە قاهیرە، تا ئەنجامی ئیمتحانەکەی بۆ نارد کە دەرچوو بوو، بەڵام شەهید پێی وابوو ئەنجامەکەی (مقبول)ە، بۆیە براکەی بۆی نەنوسیووە، چونکە خوێندنەوەکەی لە قەدەر ماجستێرەکەی نەبوو، (مقبول)یش لە (دکتۆرا) وەرناگیرێت، جا لەبەر ئەوە بروسکەیەکی دیکەی بۆ شەهید ناردو پێی ڕاگەیاند کە ئەنجامەکەی زۆرباشەیەو داوای لێ کرد کە کلێشەی دکتۆرایەکی بۆ بنێرێت، تەماشای کرد لەو قۆناغەدا یەکەم بووە، ساڵی ١٩٧٠ بوو بە

مامۆستای كۆلێژی شەریعەو لە دوای سالێك لە (بعثة)یەكدا بۆ ئەزهەر نێررا بۆ وەرگرتنی شەهادەی (دكتۆرا) و سالی (١٩٧٣) وەریگرت و گەڕایەوە بۆ زانكۆی ئەردەن و لەوێ بوویە مامۆستا.

كاتێك لە زانكۆی ئەزهەری قاهیرە دكتۆرای دەخوێند بنەماڵەی (قوتب)ی ناسی و بە وردی هەولی سەید قوتب و ماوەی گیران و شەهیدكردنی و ئەو ئازارو ناڕەحەتییەی بزووتنەوەی ئیسلامیی لە كاتی زیندانی كرانی ئەندامەكانیدا تووشیان هات لێی وەرگرتن.

عبدالله عزام زۆر پیاو بوو، پاراوی نێو تەپ و تۆزی جیهادو پەروەردەكراوی ئەشكەوت و ڕەوەزو سەنگەران و ڕاهاتووی شەڕی دەستەویەخەو تەق و تۆق و مەیدانەكانی نەبەرد بوو، هەندێ جار دەیگوت:

(جیهاد بۆ موجاهید، وەكو ئاو بۆ ماسی پێویستە)، لەبەرئەوە هەرچەندە لەو ماوەیەدا جیلێك لە مسوڵمانانی لە ئەردەن پێگەیاند، بەلام دڵە دەرياییەكەی گیانە عاشقە خواییەكەی زۆر لەوە گەورەتر بوون لە چواچێوەی دیواری زانكۆو ڕۆتینی ژیاندا بمێنێ، جا كە حاكمی عەسكەری ئەردەنی چاوی بەرایی نەهات پۆل پۆل لاوان لە تاریكستانی نەزانییەوە بەرەو خۆرهەلاتی ئیسلامی بەڕێوەن، لە زانكۆ فەسڵیان كرد، وەك مەلێكی لە قەفەز ئازاد بوو گەیشتەوە سەر ترۆپكە هەرە بەرزەكەی ئیسلام و ئەمجارەیان خۆی لە ئاپۆڕەی موجاهیدانی ئەفغانستانی (١,٥) ملیۆن شەهیددا بینیەوە.

دوای فەسڵكردنی لە زانكۆ، هەستی كرد ماوەی جیهادكردنی لە فەلەستین و دەورووبەری نەماوە، ئەویش بەبێ جیهاد هەڵناكات، لەبەرئەوە پەروانەئاسا بەرەو ترووسكایەكی ئەفغان وەڕێكەوت و بۆ ئەوەی لە نزیكەوە ئاگای لەو جیهادە پیرۆزە بێت، ماوەیەك لە زانكۆی ئیسلامی جیهانی لە (ئیسلام ئاباد)

دەستی بەكار كردن كردو پەیوەندی توندوتۆڵی بە ئەمیرەكانی جیهادەوە بەست.

لەو كاتەدا پێش ئەوەی كۆچ بكات دەیگوت: (ئەگەرماڵەكەی خۆمان پیس بێت و نوێژی نەبێت ئەوا پێویستە لە ماڵە دراوسێكەمدا نوێژ بكەم كە نوێژی بێت).

شەهید لە زانكۆی (ئیسلام ئاباد) موحازەرەكانی خستبووە (٣) رۆژەوە لە هەفتەیەكداو (٤) رۆژەكەی تری بۆ جیهاد تەرخان كردبوو، دوایی موحازەرەكانی خستە (٢) رۆژەوەو كە هەستیشی كرد دڵی بەوەندە ئاوی نەخواردەوەو دەستی لە كاری زانكۆ كێشایەوەو بە تەواوی خۆی بۆ جیهاد یەكلایی كردەوە.

بەراستی دكتۆر عبدالله ی شەهید بوویە دڵی جیهاد لە ئەفغانستان و عەقڵی بیركەرەوەو نەخشەدارێژەری بوو، هەر ئەو بوو ئەو جیهادەی لە جیهادێكی ناوچەیی كردە جیهادێكی ئیسلامی جیهانی، خۆی كردبوو بە شێوازی قەڵغانی ئەو جیهادە، لە ساڵی ١٩٨٣ پەیامێكی بڵاوكردەوەو داوای لە گەنجانی وڵاتانی ئیسلامی كرد كە بێن بەشداری جیهادی ئەفغانی بكەن، لە ساڵی ١٩٨٧ سەفەرێكی بۆ كەراچی كردو گەڕا بە زانكۆكانداو بەناو كۆڕی زاناكانداو خەڵكی هاندەدا بۆ جیهاد.

هەموو جارێك ئەیوت: (من ٤ كەس پێكیانەوە ناوم و كاریگەرییان لێ كردم، دوای خواو هیدایەتی، لە عەقیدەدا ئیبن تەیمیە، لە پەروەردەدا ئیبن قەیم، لە فیقهدا ئیمامی نەوەوی، لە بانگەوازو جموجوڵی ئیسلامی سەید قوتب)[81].

---

[81] تێبینی: چەند وتەیەكی بڵاوی سەید قطب هەیە، كە عبدالله عزام چەند جارێك دووبارەی كردۆتەوە لەبەرئەوەی بیروبۆچوونی سەید زۆر كاریگەری هەبووە لەسەر عبدالله عزام. بۆ نموونە: (إن أصحاب الأقلام يستطيعون أن يصنعوا شيئاً كثيرا، ولكن بشرط واحد: أن يموتوا هم لتعيش

(ابن تیمیە)یەك كە لە زینداندا كۆچی دوایی كردو كتێبەكانی سوتێنران، بەڵام پاش خۆی بوو بە (شیخ الاسلام) و بوو بە چرایەكی ئەم ئوممەتە، كە لە ساڵی ٧٢٨ كۆچیدا و دوور لە ١٩٦٠ ەكاندا كار دەكاتە سەر عبدالله عزام و پەروەردەی دەكات.

(ابن القیم) رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ كە ١٣ ساڵ قوتابی ئیبن تەیمیە بوو شەوورۆژ مولازەمەی كردبوو، ئەویش كە ساڵی ٧٥١ كۆچی دوایی كردو لەو دوورەوە عبدالله عزام پەروەردە دەكات بۆ ئەفغانستان. ئیمامی نەوەوی بە فیقهێكی مەنهەجیدا گەیشتبووە (المجموع) تا بەم ئسلوبە كاریگەری لیٚ كردبوو كە ئیمام (٦) ساڵ لە دیمەشقدا سەوزەو میوەی نەخوارد، چونكە ماڵی هەتیوی تێكەڵ دەبوو، نەوەوی وا كاریگەری خشتبووە سەر كە (عز بن عبدالسلام) هاوشانی نەوەویەو هەردووكیان لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا لە ئەمر بە چاكەو نەهی لە خراپەدا وەكو یەكن، بۆیە دكتۆری شەهید لەسەر مینبەر دەیوت: (هیچ كەسیٚ نییە سوڵتەیەكی جاهلی هەبیٚو رێز لە بوونی من بگریٚ).

سەید قوتبیش كاریگەری لەسەر كردبوو كە بینیبووی (سید)ێك كە رەمزی عەقیدەو عیبادەتو شەریعەتی ئیسلامە كە بەسەر سێدارەكانی (جمال عبدالناصر)دا لە بیروهۆشی مسوڵماناندایە هەتا رۆژی قیامەت، لەنجەولاری سید قطب خوێنی سید قطب هەزارانی وەك عبدالله عزام پەروەردە دەكاتو ئێمەش بە شوێن عبدالله عەززامی كێوی (هندكوش) و كێوی هەڵگوردی خۆماندا دەڕۆین، كاتیٚ كۆچی كرد بۆ ئەفغان، پاكستانو عەمیلەكانی

---

أفكارهم، أن يطعموا أفكارهم من لحومهم ودمائهم، أن يقولوا ما يعتقدون أنه حق، ويقدموا دماءهم فداءً لكلمة الحق، أن أفكارنا وكلماتنا تظل جثثاً هامدةً، حتى اذا متنا في سبيلها لو غذيناها بالدماء، لنتقضت حية، وعاشت بين الأحياء» (دراسات إسلامية لشهيد سيد قطب، ص١٣٩) (وەرگێڕ).

ڕێگەیان لە موجاهیدانی غەیرە ئەفغانی ئەگرت کە بچنە ناو ئەفغانەوە، بەڵام ئەم جلوبەرگی ئەفغانی لەبەر دەکردو بە سەیارە بە سنوورەکاندا دەڕۆی تا ئەو شوێنەی ئەگەیشتە بازگە (سیطرة) و دائەبەزی و لەسەر حدود لە (پەڕە چنات) بە رووبارەکەدا بە مەلەکردن ئەپەڕییەوە ئەوبەرو کە ئەگەیشتەوە بە هاوەڵەکانی ریشی ئەبوو بە چیلکەیەکی دار، چونکە دەیبەست، جلەکانیشی لە مشەماو کارتۆن ئەچوو، بەو زستانە ساردە لەوێوە ئەپەڕییەوە و بۆ ئەوەی زوو بگاتە مەیدانی عەمەلی جیهاد، چونکە تەفسیری (انفروا خفافا وثقالا)ی بە هەموو شێوەیەك کردبوو، شەوڕۆژ مەشغوڵی چاکسازی بوو لە بەینی ئەفغانیەکاندا مانگێکی رەبەق لە (١١) شوێنی (پەنشێر)دا ئەمات و ئەچوو بۆ دانانو دیاری کردنی مەوعیدێك لە نێوان مەسعودو حیکمتیار، بەڵام پیلانەکانی دوژمن قەسابخانەکەیان گەورەتر کرد، بۆ ئەوەی دکتۆر نەگاتە ئەنجام، کە گەڕایەوە پیشاوەر هەوڵیدا لەویّ رەبانی و حیکمتیار پێك بگەیەنێ، سەعات (٣) شەو گەیشتە بەردەرگای رەبانیو لە دەرگای داو وتی: (ئیمزای حیکمتیارم هێناوەو چاوەڕێی ئیمزای تۆم) لە کاتێکدا خاوەنی مەسئەلەکە حیکمتیار و رەبانی هەردووکیان خەوتبوون، چونکە (٣)ی شەوەو ئەوانیش پێویستیان بە حەوانەوە هەیە.

دکتۆری شەهید ئەگەر محازەرەی لە ئەمریکا بوایە، یان لە سعودیە، یا سریلانکا خەڵکەکەی هان ئەداو ئەیوت: (وەرن با سوپای موحەممەد ﷺ تەشکیل بکەین، مانگێك وەرن بۆ بەشداربوون لە جیهادی ئەفغان، بۆ ئەوەی جارێکی تر خەلیفەیەك و ئەهلی حەلو عەقد و یەك منارەمان هەبێتو رووی تیّ بکەین).

هەروەها هەستا بە دامەزراندنی (مکتب خدمات المجاهدین)، بە راستی خزمەتێکی دیارو بەرچاوی بە جیهادی ئەفغانی کرد، لە بواری کۆکردنەوەی

یارمەتی ماددی بۆیان، پاشان لە ڕێگەی گۆڤاری (الجهاد)و نووسراوەکانیەوە توانی جیهادەکە بکاتە جیهادێکی گشتی، کە لە هەموو لایەکەوە مسوڵمانان بە شەوقەوە خۆیان گەیاندە ئەفغانستان و چەندین لاو لەو پێناوەدا شەهیدبوون، ئەگەرچا کەس نەئەما داوای پارەی لێ نەکات بۆ بەردەوامبوونی ئەو جیهادە، ئافرەتانی کەنداوی ئەبینی کە ئاڵتونیان پێوەیە ئەوەندەی ئایەت و فەرموودەی ماڵ بەخشینی بۆ ئەخوێندنەوە تا لەبەر دەستییدا هەموویان دائەکەند، ئافرەتانی سۆماڵ و کینیا و سودان و شوێنە فەقیرەکانی لە بیر نەئەکردو ئەیوت: (اتقوا النار ولو بشق التمرة)، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەیزانی کە بەرەکەت لە (شق تمرة)یشدا هەیە، بۆیە داوای ئەکرد.

ئەم کەڵەپیاوە راستگۆیە بەردەوام بوو لە متابەعەکردنی جیهانی ئیسلامییش، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە مەشغوڵ بوو فەلەستینی لە بیرنەکردبوو ئاگاداری و چاودێری ئەکرد، ئەیزانی ئەو راپەڕینە کە زۆرجار خۆی ئەیوت: (بولبولێکە و خوا پەروەردەی کردووە، بەڵام دەسەڵاتداران و چڵکاوخۆرانی عەرەب و یەهودی عەرەب خستوویانەتە ناو قەفەزەوە).

بەردەوام بوو وتی: (من ئەزانم ئەو بولبولە زۆر ئەگەڕێ هەتا ماندوو ئەبێ و باڵی ئەشکێ، بەڵام ئەبێ تەئید بکرێ)، بۆیە یەکەم جار چالاکی لە بەردەبارانەوە کە بوویە چەک و رووبەڕووبوونەوەی شەهید (ضرار) کردی، کە پەروەردەی دەستی دکتۆری شەهید بوو، مەشق پێکراوێکی ئەفغان بوو.

زۆر گرنگی بە میسر ئەداو ئەیوت میسریەکان زیرەکن لە روونکردنەوەی دین، جگە لەوەش هەموو کاتێ پشتیوان بوون بۆ شام و دواییش بەتایبەتی بۆ قودس.

هەروەها بایەخی بە جەزائیریەکانیش ئەداو فێرگەی سەربازی تایبەتی بۆ ئەکردنەوەو ئەیوت: وەك زەمانی ١٩٢٨ی ئیمام بەننام دێننەوە پێش چاو کە

کوفر تارادەیەك لێی بێ ئاگابوو لە سەرەتاوە، بایەخی بە یەمەن ئەداو ئەیوت: عەشایەری پاکی تیاماوە و هەر ئەبێ ڕۆژێك بێت دینی دووەم دەرکەن، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو ئەیفەرموو: (لا یجتمع في الجزیرة دینان)، بایەخی بە وانەی سعودیە ئەداو ئەیویست دیسانەوە غیرەت و حەماسەتی ڕۆژی کەعبە (یادی جوهەیمان) لە دڵیاندا سارد نەبێتەوە، هەروەها بایەخی بە غەیرە عەرەبەکان ئەدا، بۆ نموونە بورما لەو دوورەوە پارەی بۆ کۆئەکردنەوەو بۆی دەناردن بۆ ئەوەی بە فڕۆکە بێن و تەدریبی عەسکەری بکەن و بگەڕێنەوە، چونکە ڕەش و ڕووت و فەقیر بوون.

هەروەها زۆر ئاواتیشی بوو کە کوردستان ببینێ و بگاتە موجاهیدانی نەوەی نوێی سەلاحەدینی ئەیوبی، چونکە زۆر جار ئەیوت: (من حەز ئەکەم بە زووترین کات بگەمە نەوەکانی سەلاحەددین)، بەراستی زۆر ڕاستگۆ بوو لەگەڵ ئەو تەعلیماتەی کە لە (ئیخوان المسلمین)ی وەرگرتبوو. شەوێك لە ئیسلام ئاباد لە خزمەتیا چەند برایەك مابوونەوە، بەیانی کە چوونە مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی دوای نوێژ کە هاتنە دەرەوە وتی: مەشغوڵ بوونمان بە کاروباری مسوڵمانانەوە نابێ وەرزشەکەمان لەبیر بەرێتەوە، با لەشمان نەمرێ، با لێرەوە بەڕاکردن بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە.

دکتۆری شەهید خاوەنی زانستێکی بەرفراوان بوو، دکتۆراکەی لە (أصول الفقه)دا وەرگرتبوو، بەڵام شارەزای (فقه الجهاد)ی هەموو مەزهەبەکان بوو، چونکە بە جیهانی ئیسلامییدا گەڕاوە کە لەناو ئەفغانستاندا بوو قسەی ئەکرد بەڵگەکانی هەموو بە کتێبی ئیمامی حەنەفی بوو، لە ناوچەکانی شافیعی مەزهەبدا کتێبە شافیعییەکانی بیردەهێنانەوەو لە ناوچەکانی مالیکی و حەنابیلەشدا بەو شێوە بوو، هەروەها زۆر لە (مجلد)ەکانی ئیبن تەیمیەش شارەزا بوو بەتایبەتی (مجلد ٢٨)ی (فتوی الکبری).

جارێک لە (مجموع)ی ئیمامی نەوەویدا خوێندبوویەوە کە مسوڵمانی دەوڵەمەند نابێ ئەگەر جیهاد هاتە پێشەوە لە موجاهیدێك زۆرتری هەبێ، لەبەرئەوە کە بەیانی هەستا بە منداڵەکانی وت: لەم ماڵەی ئێوەدا ئەم فەرشەم پێ ئەبرێت؟ وتیان: بەڵێ، دەڵێ فەرشەکەم هێناو دام بە (ئەبو حارث)ی زاوام و وتم: (بیفرۆشەو پارەکەی دەدەین بە جیهادی ئەفغان، چونکە ناکرێ ئەوان بەرەیەکیان نییەو ئێمەش لەسەر ئەم فەرشە دادەنیشین، هەروەها دکتۆری شەهید تێڕوانینی بەرامبەر هەموو کۆمەڵە ئیسلامییەکان خێر بوو، هەمووی بە چاك ئەزانی، بەڵام ئەیوت: چاکترینیان ئەوانەن کە کەسەکانی خۆیان ئەنێرن بۆ جیهادی ئەفغان).

دکتۆری شەهید لەلای گەنجەکان زۆر خۆشەویست بوو، ئەوەبوو جارێك لە جاجیەوە لە جەبهەوە گەنجێك هات بۆ ئیسلام ئاباد و ٦ رۆژی پێ چوو بوو، کە هاتبوو ٦ رۆژیشی ئەویست تا بگەڕایاتەوە، نیو سەعات هاتە ماڵی دکتۆر عبدالله عزامو وتی: من ئەگەڕێمەوە، وتی: بۆ لە کوێوە هاتووی؟ وتی: لە جەبهەوە، وتی: بۆچی؟ وتی: واللهی هاتووم تەماشای دەموچاوت بکەمو بگەڕێمەوە، ئەو گەنجە مسوڵمانانە ئاوەها دەورەیان لێ دابوو، بەڵام کە شەهید بوو و رۆیی (١٦٠٠٠) کەسی بەجێهێشت، هەروەها یەکەم جار هات تەدریب بە یەکەم منداڵی ئەکرد، بەڵام کە شەهید بوو (٣٦) فێرگەی بۆ غەیری ئەفغانی بەجێهێشت.

زۆریش بەزەیی بە حاڵی کوردەکان لە کوردستاندا دەهاتەوەو لە کاتێکدا هەڵەبجەو سێوسێنان و گەرمیان و شوێنەکانی تر کیمیاباران کران و راگوێزران خوتبەی ئەداو ئەیوت: (ئەگەر کوردەکان هەموویان ببنە ئیرهابی لە جیهاندا کێ لۆمەیان ئەکات). هەروەها نامەیەك ئەنووسێ بۆ بەڕێز (شێخی موجاهیدین) مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیزی رەحمەتیو تیایا دەڵێ: (لە باسی هەڵەبجەدا کە دەڵێ: (ئەو خوێنە پاکەی لە هەڵەبجە تکا، دڵنیابە لێی

دڵنیاییەکی تەواو، کە یەکەمین بزماری تەرمی ئەو کەسانەیە کە ئەو کارەیان ئەنجام داوە)، هەموو جارێ دوعای سەرکەوتنی بۆ موجاهیدانی کوردستان کردووە، ئەگەر لە هەر شوێنێکی ئەم دونیایە ببوایە، چونکە ئەوانی بە خۆی و خۆی بە ئەوان زانیوە.

جارێك لە کۆنگرەی (ضیاء الحق) کە بۆ قەزیەی ئەفغانی گیرابوو دوای کۆنگرەو موئامەرەی جنێف مامۆستایەکی موجاهیدی کوردی لەگەڵدا دەبێ و هەویەی چوونە ناو کۆنگرەی پێ نابێت، کابرای کە لەبەر دەرگاکەدایە لێی ئەپرسێت و نایەڵێت بچێتە ژوورەوە، بەڵام عبدالله عزام ئەگەڕێتەوەو پێی ئەڵێت: (کاکە بابێتە ژوورەوە، چونکە ئەمە خەڵکەی هەڵەبجەیە)، دەستی ئەگرێ و یەك یەك بە سیاسەتمەداران و وەزیرەکانی ئەناسێنێ و ئەو وێنانەشی کە کیمیابارانەکەی هەڵەبجەیەو پێیەتی خۆی لێی وەردەگرێ و دابەشی دەکات بەسەر هەموو ئەندامانی کۆبوونەوەکەدا، هەروەها ئەو شەوەی کە بۆ بەیانییەکەی شەهید دەبێ قەدەری خوا لەگەڵ ئەو مامۆستا موجاهیدە کوردەی کە لە کۆنگرەکە لەگەڵیدا بووەو کە ئێستا لە ژیاندا ماوە قسەی بۆ دەکات و دەڵێ: ئامۆژگاریتان دەکەم بەم شتانە:

١. فێرگەی سەربازی دابمەزرێنن.

٢. بایەخ بدەن بە زمانی عەرەبی.

٣. مەزهەبی ئیمامی شافیعی فێر بن.

٤. (علوم القرآن) فێر بن و هانی گەنجەکان بدەن ڕوو بکەنە خواو راستگۆ بن.

٥. هەوڵ بدەن زیاتر عەقیدەی ئیسلامی بچەسپێنن.

٦. ئیختلافات کەم بکەنەوە لەناو ریزەکانی خۆتاندا.

ڕەحمەتی خوای لێ بێ نوێژی جومعەی لە کوێدا بکردایە نوێژی عەسریشی لە هەمان شوێندا ئەکردەوە، چونکە دەستە دەستە گەنجەکان ئەهاتنە لای و

ئـەملاو ئـەولایان لـیّ ئـەگرت و ماچـیان ئـەکردو هەسـتی کـوڕێتی خۆیـان و سەربازێتی خۆیان بۆ دەردەبڕی، چونکە هەم باوك بوو هەم ئەمیر.

پێش شـەهیدبوونی هـەموو جارێك ئـەیوت: بەراسـتی مـن وا هەسـتدەکەم کـە تەمـەنم ئێـستا ٩ سـاڵە، حـەوت سـاڵ و نیـو لـە جیهـادی ئـەفغان و سـاڵ و نیوێکیش لـە جیهـادی فەلەسـتیندا، بەشـەکەی تـری تەمـەنم هـیچ نرخێکـی لـە لای من نییە).

لەبەرئەوە دوژمـن داخلەدڵەکانی ئیسلام هـەر ڕۆژە ڕایەڵەو داوی پیلانیـان بـۆ دەنایـەوە بـەو نیـازەی زەفـەری پـیّ بـەرن و لـەناوی بـەرن، تـا لـە ڕۆژی ٢٤/ ١١/ ١٩٨٩ پێش بانگی نیوەڕۆ لـە کاتێکدا بـۆ خوێندنـەوەی وتـاری هـەینی بـەرەو مزگـەوتی (سـبع اللیـل) دەڕۆیـشت لـە (پیـشاوەر)ی پاکـستان، سـەیارەکەی بـە تەنیشت مەنهۆڵی ژێرابێکدا تێپەڕی کە (٢٠) کیلۆ (TNT)ی تێدا چێنرا بـوو بە سـەیارەکەیدا تەقێنرایەوەو خۆی و موحەممـەدی کـوڕە گـەورەی (٢٠ سـاڵ) و ئیبراهیمی کوڕی (١٥ ساڵ) شەهید بوون.

خـوای گـەورە دکتـۆر عبـدالله عـەزامی شـەهیدو هـەموو شـەهیدانی بـەرگری لـە ئیسلام و ئاڵای بەرزی (لا اله الا الله محمد رسول الله) بە بەهەشتی بەرین شاد بکات و ئێمەش خوای گەورە ئەو ڕێزەمان لیّ بنێت، (آمین).

لــە مێژە لەسەر لاوازی نووستووین و نەڕەی شێران نایە
ئێمە کـۆیلـەو زەلیلیـن و ڕێوی و چەقەڵ فەرمانڕەوایە
کۆتـی کـۆیـلان لـە مـل کـەچ کـردنە نـەك لە قەف و ئەڵقەی ئاسن
کـەی ئەو زنجیرە دەپسێنن؟ سەدان ساڵە لەدەستماندایە

# چەند وەسیەتێکی دکتۆری شەهید:

١ـ هەرکەسێك پێی وتن (جیهاد مەکەن) گوێی لێ مەگرنو هیچ سەرۆكو فەرماندەیەك نابێ بۆ جیهاد و ڕاپەڕین پرسی پێ بکرێت، چونکە جیهاد کۆڵەکەی بانگەوازەو شورای ئاین و قەڵغانی شەریعەتی ئیسلامە.

٢. من پێموایە . خواش چاکتر دەزانێ . ئەمڕۆ هیچ جیاوازیەك لە نێوان کەسدا کە وازی لە شەڕکردنو جیهاد لە پێناوی خوادا هێناوەو ئەو کەسەی وازی لە نوێژو ڕۆژوو و زەکات هێناوە نییە.

وە ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەفەرموێ: جیهادم زۆر بە پێویست زانیوە، لە هەندێ کاتدا پێشنوێژو ڕۆژوو زەکاتم خستووە، چونکە موسڵمان کە وڵاتێکی سەربەخۆی نەبوو ئەوا نوێژو ڕۆژووشی گۆشەگیریە، وە پێغەمبەریش ﷺ لە مێژە فەرموویەتی: (لا رهبانیة في الاسلام). (في كل الأمة رهبانية، رهبانية هذه الأمة الجهاد)، (وعليك بالجهاد فإنه رهبانية الاسلام).

٣. هۆ زانایانی ئیسلام بۆ ڕابەرایەتی ئەم پشتەی کە بەرەو خوا گەڕاوەتەوە، وەرنە پێشێ و مەترسن و پاڵ بە دنیاوە مەدەن، توخنی سفرەی تاغوتان مەکەون، چونکە دڵو دەروونتان تاریك دادێتو دەمرن، لەم جیلە دادەبڕێنو دەبنە لەمپەر لە نێوان ئێوە و دڵی ئەواندا.

٤ـ هۆ مسوڵمانینە جیهاد ژیانتانە و ئیتر چۆن تەرکی ئەکەن، ئەو جیهادە غیرەتو سەربەرزیتانە و بونتان بە شێوەیەکی چارەنووسساز بە جیهادەوە بەندە.

٥ــ هۆ کۆمەڵی ئافرەتان، لە خۆشگوزەرانی دووربکەونەوە، چونکە خۆشگوزەرانی دوژمنی جیهادەو لەناوبەری مرۆڤە، لە زێدە مەسرەفی پارێز بکەن، هەر ئەو شتانە بکڕن کە پێویستانن و مندالآنتان لەسەر ژیری و پیاوەتی و قارەمانێتی و جیهاد پەروەردە بکەن، با ماڵەکانتان لانەی شێران

بن نەك جوجك خانە (دەواجن) بن، چونكە تيايدا قەڵەو دەبن و تاغوتەكان سەريان دەبڕن.

٦- هۆ منداڵينە لەسەر هەواى (RBG) و گرمەى تۆپ و هاڕەى فڕۆكە و گڕەى دەبابە پەروەردە بن و توخنى ئاوازى ناسكە پياوان و مۆسيقاى خۆشگوزەرانان و نوێنى تێروتەسەل مەكەون.

هەزاران سڵاوى خواى پەروەردگارى تۆڵەسێن لە گيانى پاكت دكتۆرى شەهيد.

شەرمەزارترين شەمشەمە كوێرەكانى شەوەزەنگى جاهيليەت و هەڵدێراوانى ڕێگەو كوێرە ڕێگەكان.

## پياهەڵدانى گەورە نووسەران و زانايان

شەهيد عبدالله عزام لەگەڵ وتەو نووسينەكانيدا كارو تێكۆشانى گرێدابوو، بۆيە نووسەران لەسەريان نووسيوەو باسى ژيان و بەسەرهاتەكانيان كردووە. لەوانەش ئەم كتێبانەن:

١- الشهيد عبدالله عزام مجاهداً في فلسطين وافغانستان، نووسينى: حسن خليل حسن.

٢- الشخ المجاهد عبدالله عزام الذي ترجم الأقوال الى افعال، محمد عبدالله عامر.

٣- عبدالله عزام احداث ومواقف، نووسينى: عدنان النحوى.

٤- من مناقب الشهيد عبدالله عزام، نوسينى: أحمد سعيد عزام.

بزووتنەوەى حەمماس بەم شێوەيە دواى شەهيد بوونى دكتۆر پيايدا هەڵدەدەن:

(شەهید مامۆستا عبدالله عزام ئەگەر لەسەر خاكی ئەفغانستانی موسڵمان شەهید بووبێت نەك لە سەر زەوی (شەوڕەوی) لە فەلەستین، كە خۆشیویستووەو هەوڵیداوە بۆ رزگاربوون و ئازادبوونی تاوەكو خودا كاروباری تێكۆشانی هێنایە بوون لەو خاكەدا، بەلاّم تێكۆشەرانی فەلەستین گەمارۆیەكی توندیان لەسەر بوو لە دەرەوەی فەلەستین، ئەم پیاوە ئەو گەمارۆیەی شكاند، ئەمە لە لایەك لە لایەكی ترەوە توانی نیشانەیەك بێت بۆ یەكێتی هەمو غەمی موسڵمان لە هەموو پارچەكانی دونیا، وە بەراستی لە ساڵەكانی ١٩٦٨ تا ١٩٧٠ ئەم پیاوە لە زەوی فەلەستیندا موجاهیدێكی سەرڕاست بوو).

هەرچەندە لە زەوی (شەوڕەوی) شەهید نەبوو، بەلاّم بە دڵ و دەروون و قەڵەمەكەی هەمیشە لەگەڵ فەلەستین و تێكۆشەرانی رزگاریی و ئازادیی خاكی فەلەستین بووە، مامۆستا حیدر مصطفی دەڵێ: "كاتێك عەزام بۆمان دەدواو سروشتێكی بەهێزی هەبوو وەك شەپۆلە بەرزەكانی ئاو، لە دڵیدا ئەوەی ترس بێت نەبوو، رێساكانی ژیانی دامەزراوی و نەلەخشاو و هاوسەنگی و ئیرادەی بەهێز بوو، هەوڵی ئەدا فەرمانڕەوا بێت بەسەر دەروونی خۆیدا، گوێی بە كەمی دونیا نەئەدا، دڵنیا بوو لەوەی لەزەتی دونیا لە پشوودان و دەستبەتاڵی دا نییە، بەڵكو لە بەردەوامی تێكۆشان و هێنانەوەی دینی خودایە لە سەر زەوی كە ناڕەحەتی و ماندووبوونی تێدایە.

## چەند دێڕە هۆنراوەیەکی لە سەر نووسرا، وەکو:

جهادُك قد أنار لنا الطريقا وأرشفنا على ظمأٍ رحيقاً
ومن بحرٍ إلى برٍ أمينٍ به أنقذتنا جسماً غريقا
وفي هذا الجهاد كتبت سفراً تحاكي فيه ماضينا العريقا
ركبنا فيه للعلياء متناً به جُزنا - إلى السهل - المضيقا
نسطره ملاحمَ شاهداتٍ ونرجع فيه للناس الحقوقا
ليصبح كل إنسانٍ عزيزاً ويغدو في الورى حراً طليقا

تێکۆشانی تۆ ڕێی بۆ ئێمە ڕووناک کرد
بۆ ڕزگاربوون لە تینوێتی کانیاوی بۆنخۆشی دیاری کرد
لە دەریاوە بەرەو وشکانیو ئارامی
هەموومانت لە خنکان ڕزگار کرد
لەم جیهادەدا چەندین کتێبی
گەورەت پڕ لە ڕووداوی مێژوویی دێرین کرد
بەناو نووسینەکانتدا سەرکەوتین بەرەو بەرزی
بەهۆیەوە ناڕەحەتییەکانمان بەرەو خۆشی بەڕێکرد
داستانی دیارو ناسراوت بۆ نووسین
تا مافەکان بگێڕینەوە لای خەڵکی وەك نەبەرد
تا گشت کەسێ ئەوەندە سەربەرزبێ
لەناو مرۆڤەکاندا بە ئازادی ژیان بەسەربەرێ

دەزگای خێرخوازی جیهانی ئاوها بە خەمەوە باسی شەهید عەززام دەکات: "دەزگاکەمان یەکێك لە دامەزرێنەرانی خۆی لە دەست چوو، بەڵام خەفەت لەوەش دەخۆین کە پیاوێکی لە خواترسو خۆپارێزو دڵسۆز لە کیس چوو، پیاوێك کە خۆی فرۆشتبوو بە خوای خۆی، خۆیو ماڵو منداڵی لە شاری

بیشاوەر دەژیان و بەشداری جیهادی ئەفغانی دەکرد، بۆ شەهیدی لە مەیدانی جیهاددا بوو، ئازایەتی و قوربانیدان نیشانەی ئەوبوون، لە هەڕەشەی کوشتن و پەنهانگیری نەدەترسا".

راستی لە قسە و قووڵی لە تێگەیشتن، وە ئیرادەی بەهێز لە نووسینەکانی دەبینرێت، هەروەك دەفەرموێت: "بەراستی خودا جیهادی فەرز کردووە لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزێکی تەواو و پێویست، کە راکردن لێی نییەو رزگاربوون لێی نییە، وە خوێنی موجاهیدان کە پاك و خاوێنە، بارمتەی سەرکەوتنی دونیاو ناونیشانی سەرکەوتنە لە دواڕۆژدا، هەڕەشەی کردووە لە وانەی کە دانیشتوون بە توندوترین تۆڵە، خراپترین سیفەت و نازناوی لێ ناون لە هیچ یاسایەکی کۆن و تازە، نایینی و دنیایی دانا نابینی گرنگی بە تێکۆشان و سەربازو سەرکارو هاندانی ئوممەت و کۆکردنەوەیان بەیەکڕیزی بۆ بەرگری لە راستی ئەوەندەی لە ئیسلامدا بە درێژایی و بە تەواوی باس لەم مەسەلانە بکات".

یان دەفەرموێت: "بەراستی خۆشەویستی جیهاد ژیان و دەروون و هەست و دڵمی داگیر کردووە، بەراستی ئاواتی دوور لە ئامادەکاری دەروون لاوازەکانە، کە نایەنەوێ بگەنە بەرزی یان بگەنە لوتکە، مانەوەی پاڵ مزگەوتی (حەرام) و ئاوەدانکردنەوەی ناکرێ لە بەرامبەر جیهادکردن لە رێی خوادا بەراورد بکرێ، بەراستی خەم نەخواردن لەوەی مسوڵمانان لە زەوی سەردەبڕێن، ئێمە زیکری (لا حول ولا قوة الا بالله) بکەین، یان (انا لله وانا الیه راجعون) وەدەست راوەشێنین، بەڵام نەمانجوڵێنێ بەرەو هەنگاوێك کە پێمان بخات بەرەو مەسەلەی مسوڵمانان، بەراستی ئەمە گاڵتەو یاریکردنە بە دین، وە جوڵاندنی هەست و نەستی سارد و ناڕاست، کە بە درێژایی کاتەکان خۆیان هەڵخەڵەتێنێ".

# عەززام

پرسیم لە زەوی بۆ دەگری؟!
پرمەی گریان
نەی هێشت وەڵامم بداتەوە
ڕووم کردە ئاسمان و پرسیم؟!
بینیم ئەویش کزو ماتە
هیچ وەڵامم ناداتەوە
پاش ماوەیەك
هەواڵم بیست چۆن هەواڵێ!
پەردە لەسەر دەم و چاوی
ڕەنگاو ڕەنگی زۆردارەکان
هەڵدەماڵێ...
هەواڵم بیست:
گوڵی بۆنخۆشی گەشاوەی
باخچەی جیهاد پەرپەڕ کرا
پەیامنێری
مەیدان و هەوڵ لێبڕان
بێدەنگ کرا
پیری جیهاد
شەهید کرا...
ئەی شەهیدی
ڕێگای جیهادی ئەفغانی!

خۆشەویستی..

لەناو دڵی هەمووماني

دڵنیابە!

پەیمان نەدەین

ڕێگای نەبڕاوەت بەر نەدەین...

ڕێگای نەبڕاوەت بەرنەدەین...

(صلاح الدين بابكر)

# دانراوەکانی شەهید دکتۆر عبدالله عزام

ئەم موجاهیدە شەهیدە، ئەم زانا ئیشکەرە، ئەم بانگەوازکارە پەروەردەییە و ئەم کۆچکردووە (عبدالله عزام) ئەوەی تێکۆشەرانی وەك قەسامە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پیاوە سامانێکی گەورەی زانستی لە کتێبی بەنرخ بەجێهێشتووە کە دەگاتە (٢٠) کتێب، ئەمانە هەندێکیانن:

١- نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا لە جیهادی ئەفغان (آيات الرحمن في جهاد الافغان).

٢- ئیسلامو داهاتووی مرۆڤەکان (الاسلام ومستقبل البشرية).

٣- بگە بە کاروان (الحق بالقافلة).

٤- حوکمی کارکردنی بە کۆمەڵ (حكم العمل في جماعة).

٥- فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە (الامر بالمعروف والنهي عن المنكر).

٦- حەماس ڕیشەی مێژوویی و بەڵگەنامەکان (حماس جذور التاريخية والميثاق).

٧- بەرگری لە زەویە داگیرکراوەکان فەلەستین گرنگترین فەرزی عەینە.

٨- شێرپەنجەی سوور (السرطان الأحمر).

٩- العقيدة واثرها في بناء الجيل.

١٠- المنارة المفقودة.

١١- حوکم و ئادابەکانی جیهاد (للجهاد آداب وأحكام).

١٢- تاوانی کوشتنی موسڵمان (جريمة قتل النفس المؤمنة).

١٣- مژدەکانی سەرکەوتن (بشائر النصر).

١٤- كلمات على خط النار الاول.

١٥- نامەیەکی دکتۆرا کە لە ئەزهەر وتووێژی لەسەر کرا.

(دلالـة الكتـاب والـسنة علـى الأحكـام مـن حيـث البيـان والإجمـال والظهـور والخفاء).

ئەمە بێجگە لە بەشێکی زۆر لە وتارو بڵاوکراوەو لێکۆڵینەوەو ئەو وانانەی کە هەیبوو.

## سەرچاوەکان:

ئەو سەرچاوانەی سوودی لێوەرگیراوە:

١. الشهيد عزام بين ميلاد والاستشهاد.

٢. کۆڕی شەهید دکتۆر عبدالله عزام.

٣. من أعلام الدعوة والحركة الاسلامية المعاصرة. عبدالله عقيل.

٤. موقيع الموسوعة الحرة (ويكيبيديا).



سروشتێکی بەهێزو ئیرادەی بەهێز



ألا إن قوة الرمي، ألا إن قوة الرمي، ألا إن قوة الرمي،



کەسێ دڵ فراوان و زیندوو بێت

تا دەگاتە ئاوات دەبێت ماندوو بێت



شەهید لەگەڵ پۆلێك لە موجاهیدین لە ئەفغان




**شەهید لە کاتی بەسەرکردنەوەی جەبهەکاندا**


الشيخ الزنداني في حديث خاص مع الشيخ عبد الله -رحمه الله-

**شەهید لەگەڵ عبدالمجید الزندانی دا**

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾

آل عمران: ١٦٩





"شەهیدان نوری چاوو وزەی بەردەوامی گیانمان" (م. عثمان عبدالعزیز)

# پێڕست

زۆر سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە یارمەتیان دام لە وەرگێڕان و چاپکردنی ئەم کتێبەدا، خوای گەورە بۆیان بکاتە توێشووی قیامەت.

# پڕۆژەی (باشترین هاوڕێ)

## بڵاوکردنەوەی پەیام و بیری ڕەسەن و سەردەمیانە لە ڕێگەی کتێب و نامیلکەوە بۆ سەرجەم توێژەکان.

بەرهەمەکانی پڕۆژە :

١ـ ماکا ئیسلام گەڕایەوە، (توێژینەوەیەکی کورتە لەسەر داهاتووی ئیسلام) نوسینی ئیکرام کریم.

٢ـ فەرهەنگی بانگخوازان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٣ـ بەرەو پەروەردەی ئیسلامی، نوسینی (ئەندازیار عوسمان)

٤ـ ڕامان لە قورئان، نوسینی (ئەندازیار عوسمان).

٥ـ بەخشین لە پێناوی خوادا، نوسینی (عەمر خالید) وەرگێڕانی (روقیە صدیق).

٦ـمانای ناوە جوانەکانی خوا، وەرگێڕانی (م.عمر نیظامی).

٧ـ گەڕانەوە لای خوا (سبحانە وتعالی)، نوسینی: عەلی باپیر.

٨ـ نائومێدنەبوون لە سۆز و میهری خوایی، نوسینی ئەحلام حەمەشەریف

٩ـ باڵاپۆشی، ڕێگرەکانی و مەرجەکانی.

١٠ـ بگە بە کاروان، نوسینی عبداللە عەزام، وەرگێڕانی باوکی عبدالرحمن.

١١ـ سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ)، نوسینی مەلا ئەحمەدی شەریعە.

١٢ـ سەروەرانمان لە مێژوودا، نوسینی د. مصطفی سباعی، وەرگێڕانی روقیە صدیق.

abu ali alkurdy٩٦٩٦



"إن أقوالنا وأفعالنا ستظل جُثثاً هامدةً ما لم نُسقِها بدمائنا"

"بەڕاستی کردار و گوفتارمان وەکو لاشەیەکی بێ گیان دەمێنێتەوە ئەگەر بە خوێنمان ئاوی نەدەین"

"علّمني الجهاد إن الاسلام شجرة لا تعيش إلاّ على الدماء"

"جیهاد فێری کردم کە ئیسلام درەختێکە بە خوێن نەبێ ناژێ و سایە و سێبەری نابێت"

# بگە بە کاروان

مطبعة زانا

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی ( ٢٧٨٥ ) ی ساڵی ( ٢٠١٠ ) ی پێدراوە